حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عێراق

وەزارەتی پەروەردە

بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

## بۆ پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی

**دانانی**

**جوگرافیا** د. جەزا توفیق طالب بەیان حسین
احمد علی احمد

**مێژوو** رافدە عبداللە عبدالصمد عطا عبدالرحمن
شوان عثمان ئاراس فریق زینل
صلاح کانەبی اسماعیل

**هاونیشتمانی بوون** سەرکۆ احمد محمود کامل نوری علی

چاپی دوانزەهەم ٢٠١٦زایینی - ٢٧١٦کوردی - ١٤٣٧کۆچی

# بەشی یەکەم
## دەروازەیەك بۆ زانستی جوگرافیا

لەو کاتەی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی ژیاوە، تاوەکو ئێستاش زەوی کاریگەری لەسەر مرۆڤ هەبووەو هەروەها مرۆڤیش کاریگەری لەسەر رووی زەوی هەبووە. هەر لەسەرەتاوە مرۆڤ بیری لە گۆڕانکارییە سروشتیەکان کە کاریگەری لەسەر هەموو دیاردە هەمە چەشنەکانی وەکو (لافاو، بومەلەرزە و گڕکانەکان) هەبووە، ئەم بیرکردنەوەیەش سەرەتایی دەرکەوتنی زانستەکان بوو.

جوگرافیاش یەکێکە لەو زانستانە:

### پێناسەی جوگرافیا

زانستێکە لەدیاردە سروشتی مرۆییەکانی سەر رووی زەوی دەکۆڵێتەوە و شیان دەکاتەوە ، لە رووی لەیەکچوون و جیاوازی و کاریگەریان لەسەر یەکتری.

## لقەكانی جوگرافیا:

**جوگرافیا بە گشتی دەكرێت بە دوو لقی سەرەكی یەوە:**

**یەكەم: جوگرافیای سروشتی**

لە هەموو دیاردە سروشتییەكانی سەر زەوی دەكۆڵێتەوە، وەك بەرزونزمی، ئاوو هەوا، زیندەوەران.

**دووەم: جوگرافیای مرۆیی:**

ئەو بەشەی جوگرافیایە كە لە مرۆڤ دەكۆڵێتەوە، لە ڕووی دابەش بوون، نیشتەجێ بوون، پێكهاتە كۆمەڵایەتی و چالاكییەكانی مرۆڤ و پەیوەندی ئەمانە هەمووی بە لایەنە سروشتییەكانەوە.

## نەخشە

**پێناسەی نەخشەو ڕەگەزەكانی نەخشە:**

**نەخشە:** هۆیەكی بە چاو بینراوی فێركردنە كە بە هۆی وێنەو هێماكانی ناوییەوە هەموو دیاردە سروشتییەكان و مرۆڤییەكانی سەر ڕووی زەوی بە ئاسانی دەخوێنینەوەو شارەزایان دەبین، لەبەر ئەوەی چاوی مرۆڤ تەنها مەودایەكی دیاریكراو دەبینێت كەواتە مرۆڤ پێویستی بە نەخشەیە بۆ ئەوەی ڕووبەرێكی گەورەتر شارەزابێت و ببینێت، چونكە نەخشە دیاردەكانی سەر ڕووی زەوی بە بچووككراوەیی نیشان دەدات، گرنگە نەخشە ئەم ڕەگەزانەی لای خوارەوەی تیادا بێت:

### ١- ناونیشان:

پێویسته هەموو نەخشەیەك ناونیشانێكی تایبەتی هەبێت كە ئەو ناونیشانەیە ناوەڕۆكی نەخشەكە ڕوون بكاتەوە، باشتر وایە هەر نەخشەیەك تایبەت بێ بەیەك بابەتی دیاری كراوەوە وەك:(نەخشەی ڕامیاری كیشوەری ئاسیا) یان نەخشەی (ڕووەكی خۆڕسك لە ئەوروپا) و جۆرەها بابەتی تر. مەرجە ناونیشانی نەخشە بە خەتێكی ڕوون و گەورە لە شوێنێكی گونجاوی نەخشەكەدا بنووسرێ. دەبێت هەموو نەخشەیەك چوارچێوەیەكی بۆ بكێشرێت.

### ٢- پێوەری نەخشە:

كاری نەخشە بریتی یە لە نواندنی ڕووبەرێكی فراوانی دیاردەكانی ڕووی زەوی بە بچووككراوەیی لەسەر كاغەز و لەبەر بچووكی ڕووبەری كاغەز لە چاو ڕووبەری دیاردەكان لەسەر زەوی لەبەر ئەوە پێویستە دیاردەكان كە دەخرێنە سەر نەخشە بچووك بكرێنەوە، بەڵام بە ڕێژەیەكی گونجاو كە ئەو ڕێژەیەش پێی دەوترێت پێوەری نەخشە كەواتە پێوەری نەخشە. بریتییە لە پەیوەندی دووری نێوان نەخشەو دوورییە هاو بەرامبەرەكانی لەسەر زەوی.

### جۆرەكانی پێوەری نەخشە:

#### أ- پێوەری نوسراو:

ئەمە ئاسانترین و سادەترین جۆری پێوەرەكانی نەخشە كێشانە كە بەم شێوەیە دەنوسرێت:

(یەك سانتیمەتر بۆ یەك كیلۆمەتر) واتا یەك سانتیمەتر لەسەر نەخشە بەرامبەر بە یەك كیلۆمەترە لەسەر زەوی.

**ب- پێوەری ژمارە:**

ئەم پێوەرەیان لە شێوەی کەرت یان ڕێژەدا دەنووسرێت، پێوەری کەرتی بە شێوەی کەرت دەنوسرێت بەم شێوەیە ($\frac{1}{100000}$) کە سەرەوەی کەرتەکە دووری دەنوێنێت لەسەر نەخشە، بەڵام ژێرەی نەخشە دووری دەنوێنێت لەسەر زەوی واتا ١ سانتیمەتر لەسەر نەخشە بەرامبەر ١٠٠٠٠٠ سانتیمەترە لەسەر زەوی.

پێوەری ڕێژەیی کە لە شێوەی ڕێژەدا دەنوسرێت بەم شێوەیە ١: ١٠٠٠٠٠ واتا ١ سانتیمەترە لەسەر نەخشە بەرامبەر ١٠٠٠٠٠ سانتیمەتر لەسەر زەوی.

**ج- پێوەری هێڵێکرد:**

لە شێوەی هێڵێك دا دەکێشرێت وەك لە وێنەی (١) دیارە کە هێڵەکە بەش بەش دەکرێت هەریەکە لەو بەشانە دووری دەنوێنێت لەسەر نەخشە بەرامبەری ژمارە دەنوسرێت بە کیلۆمەتر کە دووری دەنوێنێت لەسەر زەوی. پێوەری هێڵکرد بە پێوەرێکی باش دەزانرێت چونکە بەکارهێنانی ئاسانە بۆ دۆزینەوەی دووری تەنها بە ڕاستەیەك دوورییەکان لەسەر نەخشە دەپێوین پاشان ڕاستەکە دەخەینە سەر پێوەرە هێڵییەکە ڕاستەوخۆ دووریەکەمان بۆ دەردەکەوێت لەسەر پێوەرەکە چەندە.




شێوەی ژمارە (١) جۆرەکانی پێوەری هێڵکرد

**پێوەری ئاراستەکان:**

چوار ئاراستەی سەرەکی هەیە (باکوور، باشوور، خۆرهەڵات، خۆرئاوا) لە نەخشەدا ئاراستەی باکوور بە شێوەی تیرێکی بچووك دەکێشرێت لە بەشی سەرەوەی نەخشەکەدا وە دیاری کردنی ئاراستەی باکوور زۆر گرنگە چونکە بەهۆی ئاڕاستەی باکوورەوە دەتوانین ئاڕاستەکانی تر دیاری بکەین، ئەگەر بەرامبەر نەخشەیەك بوەستین بەهۆی ئاڕاستەی باکوورەوە دەتوانین

باشـوور دیـاری بکـەین کـە پێـچەوانەکەیەتی و دەسـتی ڕاسـتمان خۆرهـەڵات دەبێت و دەستی چەپمان دەبێت بە خۆرئاوا. سەیری شێوەی ٢ بکە، هەروەها چوار ئاراستەی ناسەرەکی هەیە وەک (باکووری خۆرهەڵات، باشووری خۆرهەڵات باکووری خۆرئاوا، باشووری خۆرئاوا).




شێوەی ژمارە(٢) ئاڕاستەکان دیاری دەکات

## کلیلی نەخشە:

ناتوانرێت نەخشە هەموو شتێکی لەسەر بنووسرێت لەبەر ئـەوە ڕەنـگ و هێماو هێڵ بـەکاردەهێنرێت لـە نەخـشەدا بـۆ ڕوونکردنـەوەی ڕواڵەتـەکان و لەلای چەپی خوارەوەی نەخشە چوار گۆشەیەك یان لاکێشەیەك دەکێشرێت کە پێی دەوترێت (کلیلی نەخشە) هەموو ڕەنگ و هێمای ناو نەخـشەکە ڕوون دەکاتــەوە، ڕەنـگ یەکێکـە لـەو ڕێگایانــەی بـۆ ڕوونکردنـەوەی دیـاردە جوگرافیـەکانی سـەر زەوی بـەکاردەهێنرێت کـە شـاخەکانی ڕەنگـی قـاوەیی دەدرێتیّو دەشتەکان بە ڕەنگی سەوز نیشان دەدرێـن و بانـەکان بـە ڕەنگـی زەرد و ئاوەکانیش بە ڕەنگی شین دەنوێنرێت کە ڕەنگی شینی تۆخ بۆ زەریا قوڵـەکان بــەکاردەهێنرێت وە شــینی کــاڵ بــۆ ئــەو شــوێنانەی کــە قــوڵی ئاوەکانیان کەمترە، سـنوری دەریـا و زەریاکـانیش بـە هێڵـی شـینی تێـر

دەکێشرێت کە هێڵێکی پێچاو پێچە کە هێڵی بەیەك گەیشتنی ئاوی دەریا و زەریاکانە لەگەڵ وشکانی و پێی دەوترێت (هێڵی کەناراو).




نەخشەی ژمارە(١)
بەرزی و نزمی
رووی زەوی کیشوەری
ئەمریکای باشوور

## جۆرەکانی نەخشە:

نەخشە چەند جۆرێکە، هەریەکەشیان دیاردەیەك یان زیاتر (سروشتی بن یان مرۆڤی) دەنوێنن، وە گرنگترین جۆرەکانی نەخشە ئەمانەن:

### نەخشە سروشتییەکان:

ئەو نەخشانەی کە دیاردە سروشتییەکان دەنوێنن وەك:

### أ- نەخشەی بەرزو نزمی ڕووی زەوی:

ئەم نەخشانە بەرزو نزمی ڕووی زەوی دەنوێنن وەك چیاکان و بانەکان و دەشت و دۆڵەکان و ڕووبەری ئاوی و وشکانی کە ڕەنگەکان لەم جۆرە نەخشانەدا زۆر بەکار دەهێنرێت.

## ب- نەخشەی ئاو و هەوایی:

ئەم نەخشانە دیاردەکانی ئاوو هەوا لەسەر زەوی نیشان دەدەن وەکو پلەکانی گەرمی پەستانی هەواو ئاراستەکانی باوشێ و باران لەم جۆرە نەخشانەدا ڕەنگ کردن و سێبەرو هێڵ بەکاردەهێنرێت بۆ ڕوونکردنەوەی دابەش کردن دیاردە ئاوو هەواییەکان لەسەر ڕووی زەوی.




نەخشەی ژمارە (٢) نەخشەی دابەشکردنی تێکڕای باران بارین لە عێراق دا

## ج- نەخشەی دەریا و زەریاکان:

ئەم جۆرە نەخشانە دابەش بوونی زەریاکان و دەریاکان نیشان دەدات، وە بایەخیش دەدات بە زانینی قوڵاییەکانیان کە بە هۆی ڕەنگە شینە پلە پلەکانەوە دەنوێنرێت، کلیلی ڕەنگەکانیان بۆ دروست دەکرێت. هەروەها

ڕێڕەو و ئاڕاستەی تەوژمە دەریاییەکان و دیاردەی تری سروشتی دەریا و زەریاکان ڕوون دەکاتەوە.

### د- نەخشە زیندەوانییەکان:

ئـەم جـۆرە نەخـشانە دابـەش بـوون و جۆراوجـۆری ڕووەك و ئـاژەڵ دەنوێنێت لەسەر ڕووی زەوی بە شێوەی ڕەنگ یان هێما یان سێبەر وەك لـە نەخشەی ژمارە (٣) دیارە.




نەخشەی ژمارە (٣) دابەشکردنی ڕووەکی خۆڕسک لە عێراقدا

## نەخشە مرۆڤییەکان:

**ئەم جۆرە نەخشانە دیاردە مرۆڤییەکان دەنوێنێت وەك:**

### أ- نەخشەی دابەش کردنی ئابووری:

ئـەم نەخـشانە گرنگـی دەدەن بـە لایـەنی ئـابووری وەك کـشتوکاڵ، ئاژەڵداری، کـانزا، پیـشەسازی، بازرگـانی، ڕێگـای گواسـتنەوە، وە گرنگـی

دەدەن بە دابەش کردنیان بەسەر ڕووی زەویداو ڕەنگ و سێبەرو هێما بەکار دەهێنرێت لەم جۆرە نەخشانەدا، سەیری نەخشەی ژمارە (٤) بکە.




نەخشەی ژمارە (٤)

نەخشەی سامانی کانزا لە هەرێمی کوردستانی عێراق دا

### ب- نەخشەی دانیشتوان:

ئەم نەخشانە دانیشتوان دەنوێنێت لە ڕووی دابەشبوونیان و چڕییان و پێك هاتەیان، هەروەها مەڵبەندە ئاوەدانکراوەکانی شارو لادێ نیشان دەدەن بە شێوەی خاڵ و سێبەرو هێماو بازنە و ڕەنگ.

### ج- نەخشەی ڕامیاری:

ئەو جۆرە نەخشانەیە کە یەکە ڕامیاریـەکان نیـشان دەدەن وەك وڵاتـان بە شـێوەی ڕەنگـی جیـاواز کـە هـەر دەوڵەتـە بـە ڕەنگێکـی تایبـەت نیـشان دەدرێت.

## نەخشە مێژووییەکان:

ئەم جۆرە نەخشانە کە دیاردەیەکی سروشتی یـان مرۆڤـی لـە ڕابـردوودا نیشان دەدەن وەك نەخشەی جەنگەکان یان نەخشەی ڕێگای بازرگانی کۆن، وە ئەم نەخشانە ڕەنگ و سێبەرو هێماو هێڵ یان تیر بەکار دەهێنن.

## نواندنی هەندێ دیاردەی جوگرافی لەسەر نەخشە :

دیاردە جوگرافییەکان هێمای تایبەتییان هەیە بۆ نواندنیان لەسەر نەخشەو ئەمەش چەند هێمایەکن:

(أ) **ڕێگاکانی هاتووچۆ**: لەسەر نەخشە هێمای تایبەتییان هەیە وەك ڕێگای ئاسایی قیرتاوکراوی ئوتومبێل لەسەر نەخشە بە شێوەی هێڵی سوور دەکێشرێت بەڵام ئەگەر ڕێگاکە قیرتاو نەکراوبێت بە شێوەی هێڵی پچڕ پچڕی ڕەش دەکێشرێت، وە هێڵی ئاسن لەسەر نەخشە بە هێڵێك دەنوێنرێت کە بە هێڵی ورد بڕاوە یان لە شێوەی دوو هێڵی باریك و ڕەش کە تەریب ببێت بە یەکتری دەکێشرێت.

(ب) **شارەکان**: لەسەر نەخشە لە شێوەی بازنەی گەورەو بچووك دا دەنوێنرێت بەڵام پایتەختەکان لە شێوەی چوار گۆشەیەکی بچووك کە بازنەیەکی لەناودایە دروست دەکرێن.

(ج) **سنوورەکان**: بە شێوەی هێڵی سووری پانی پچڕپچڕ دروست دەکرێن. بەڵام ئەگەر سنوری کارگێڕی بن بە شێوەی هێڵی ڕەشی پچڕپچڕ دروست دەکرێن.

(د) **ڕووبارەکان**: ڕوبارە وەرزییەکان (کاتیەکان) بە هێڵی پچڕپچڕی شین دروست دەکرێن. بەڵام ڕووبارە هەمیشەیەکان بە هێڵی شین بە گوێرەی فراوانی ڕووبارەکان تۆخ و خاڵ دەبێت.

(هـ) **ڕووبەرە ئاوییەکان**: دەریاچە وەرزییەکان و زۆنگەکان بە شێوەی پەڵەی شینی کاڵ کە بە هێڵی پچڕ پچڕ پڕ کراونەتەوە دەنوێنرێن. هێمای ڕەنگەکانی، نەخشە زۆر گرنگە چونکە زمانی نەخشەن و بە هۆیانەوە دەتوانین بە ئاسانی نەخشە بخوێنینەوەو تێیان بگەین.




نەخشەی ژمارە

- ٦ -

ڕێگاکانی هەرێمی کوردستان

## زاراوەکـــــان

| | |
|---|---|
| Geography | ١- جوگرافیا |
| Scince | ٢- زانست |
| Earth | ٣- زەوی |
| Natural Geography | ٤- جوگرافیایی سروشتی |
| Human Geography | ٥- جوگرافیایی مرۆیی |
| Map | ٦- نەخشە |
| Title | ٧- ناونیشان |
| Scale | ٨- پێوەر |
| North | ٩- باکوور |
| South | ١٠- باشوور |
| East | ١١- خۆرهەڵات |
| West | ١٢- خۆرئاوا |
| Symbol | ١٣- هێما |
| Colour | ١٤- ڕەنگ |
| Circle | ١٥- بازنە |
| Point | ١٦- خاڵ |
| Line | ١٧- هێڵ |

# پرسیارەکانی بەشی یەکەم

پ١/ پێناسەی ئەمانە بکە:

١- زانستی جوگرافیا. ٢- جوگرافیای مرۆیی.

٣- نەخشە. ٤- پێوەری نەخشە

٥- نەخشەی ڕامیاری. ٦- نەخشەی مێژووییەکان.

پ٢/ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەرەوە:

١- بوارەکانی لێکۆڵینەوەی جوگرافیا بە گشتی دوو جۆرە:

١- ..................... ٢- ..................... .

٢- لقەکانی جوگرافیای سروشتی ئەمانەن:

١- ..................... ٢- .....................

٣- ..................... .

٣- لقەکانی جوگرافیای مرۆیی ئەمانەن:

١- ..................... ٢- .....................

٣- ..................... ٤- .....................

٤- ڕەگەزە گرنگەکانی نەخشە بریتین لە:

١- ..................... ٢- .....................

٣- ..................... .

٥- گرنگترین پێوەرەکانی نەخشە ئەمانەن:

١- ..................... ٢- .....................

٣- ..................... .

٦- پێوەری کەرتی لە ............... و ................. پێك دێت.

٧- ڕەنگی ئاسایی جادەی قیرتاوکراو لەسەر نەخشەکان ............ و قیرتاو نەکراوەکانیش بە هێڵی .............. ی ............ هێما دەکرێت.

٨- لەسەر نەخشە ڕووبارە وەرزییەکان بە شێوەی ............. ی .............. دەکێشرێت.

٩- بە شێوەیەکی گشتی نەخشە دوو جۆرە:

١- ..................    ٢- .................. .

١٠- نەخشە سروشتییەکان ئەمانەن

١- ......................    ٢- ......................

٣- ......................    ٤- ...................... .

پ٣/ هۆی ئەمانەی خوارەوە لێك بدەرەوە:

١- مرۆڤ لە مێژەوە زانیاری جوگرافی زانیوە؟

٢- نەخشە گرنگترین هۆی بەچاو بینراوی فێرکردنە؟

٣- پێوەری هێڵکرد لە جۆرە پێوەرەکانی تر باشترە؟

## چالاکی:

قوتابی ئازیز هەوڵ بدە نەخشەیەك بکێشیت، بەڵام مەرجە گرنگەکانی نەخشەی تێدا بێت بەسەرپەرشتی مامۆستای وانەکەت.

# بەشی دووەم

# زەوی و پەیوەندی بە کۆمەڵەی خۆرەوە

## پێشەکی:

لە پێشدا باوەڕ وابوو کە ئەم گەردوونە دوورییەکی دیاری کراوی هەیە، ژمارەی ئەستێرەکانیشی زۆر نییە ، بەلام پێشکەوتنی زانیارییەکانی ئەستێرەناسی و بۆشایی ئاسمان ناسی و داهێنان و پەرەپێدانی ئامێری ئەستێرە بین بووە هۆی دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ئەستێرەو هەسارۆکەکان کە زۆر لە زەویمانەوە دوورن.

دانیشتوانی دێرینی وایان دەزانی کە خۆر چەقی گەردوونە وە هەروەها ئەو باوەڕەی کە لە ئەوروپادا تا کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست باو بووە دەیگوت ئەم زەویەی کە لەسەری دەژین چەقی گەردوون پێك دەهێنێت، بەلام پاش پەیدابوونی لێکۆڵینەوەکانی کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ لە سەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپا لە سەدەکانی (١٥-١٦) زایینی ئەوە چەسپاوە کە زەوی هەسارەیەکی سەر بە خۆرە وەك هەموو ئەو هەسارانەی تر کە بەدوایدا دەسووڕێنەوە و ژمارەی ئەم هەسارانەش (نۆ)یە: (عەتارد، زوهرە، زەوی، مەریخ، موشتەری، زوحەل، ئۆرانۆس، نیپتۆن، بلۆتۆ). سەیری شێوەی ژمارە (٣) بکە.

دووری زەوی لە خۆرەوە بە پلەی سێیەم دێت لە دوای هەردوو هەسارەی عەتارد و زوهرە، ئەم دوورییە وای لە زەوی کردووە کە ڕادەیەکی مام ناوەندی گەرمی خۆر وەربگرێت و ئەو ڕادەیەش بەس بێت بۆ بوونی ژیان لەسەری.



پلۆتۆ بە گوێرەی زەوی



نپتۆن بە گوێرەی زەوی



ئۆرانۆس بە گوێرەی زەوی



زوحەل بە گوێرەی زەوی



موشتەری بە گوێرەی زەوی



مەریخ بە گوێرەی زەوی



مانگ بە گوێرەی زەوی



زوهرە بە گوێرەی زەوی



عەتارد بە گوێرەی زەوی




شێوەی ژمارە(٣) وێنەی کۆمەڵەی خۆرە

**وە هەسارە گەڕۆکەکان لەم خاڵانەدا هاوبەشن:**

**١- شێوەی گۆیی یان نیمچە گۆیی.**

**٢- سووڕانەوەی بەدەوری خۆردا لە چەند خولگەیەکی جێگیردا بە پێچەوانەی خولانەوەی میلی کاتژمێرەوە.**

**٣- گەرمی و ڕووناکی لە خۆرەوە وەردەگرن، واتە نزیکترین هەسارە لە خۆرەوە گرمترینیانە.**

## شێوەی زەوی:

لە کۆندا بیرورِا وا بوو زەوی وەکو تۆپە، لە دۆڵی دوو رووباران بە بازنەیەکی خڕیان داناوەو لە دۆڵی نیل بە جەستەیەکی چەماوە وەسف کراوە، هەروەها ئەغریقییەکان هەمان بیروبۆچوونی میسرییە کۆنەکانیان هەیە. بیرورِای راستەقینە لە بارەی شێوەی زەوی لەسەر دەستی زانایانی موسوڵمان سەری هەڵدا بۆ نموونە خەوارزمی و ئیدریسی کە گۆیەکی لە زیو دروست کردبوو.

ئەو بەڵگانەی خڕێتی زەوی ئەسەلمێنن ئەمانەن:

١- بە دوا یەکدا هاتنی شەوو رِۆژ.

٢- لاربوونەوەی ئاسۆو لە سەر رِووی زەویدا لە چاوی بینەر.

٣- دەرکەوتنی بەشە بڵندەکانی کەشتی پێش بەشەکانی تری کاتێك کە لە رِۆخی دەریا نزیك دەبێتەوە وەك لە وێنەکەدا دیارە.

٤- گەشتی ماجەلان: پاش گەشتێکی دەریایی چەند ساڵە گەڕایەوە هەمان شوێن.

٥- مرۆڤ بەهۆی گەشتە ئاسمانییەکانەوە توانیویەتی وێنەی زەوی لە بەرزییەکی زۆرەوە بگرێت، وەك لە شێوەی ژمارە (٥) دیارە.




شێوەی ژمارە (٤) دەرکەوتنی سەرەوەی کەشتی

دەرکەوتنی کەشتی ونبوو بەهۆی خڕی زەوییەوە

## جیاوازی نێوان هەسارە و ئەستێرە:

١- ئەستێرە تەنێکی گازییە، بەڵام هەسارە تەنێکی ڕەقە.

٢- ئەستێرە خۆی گەرمی و ڕووناکی بەرهەم دەهێنێت، بەڵام هەسارە گەرمی و ڕووناکی وەردەگرێت.



شێوەی ژمارە (٥)

(خڕێتی زەوی وەکو لە مانگە دەستکردەکان نیشانی دەدات)

بەڵام پێشکەوتنی زانیاری ئەوەی چەسپاندووە کە شێوەی زەوی بە تەواوی خڕ نییە، بەڵکو شێوەیەکی وەك تۆپی لاپانی هەیە.

## جووڵەی زەوی:

زەوی و هەسارەکانی تر لە جووڵەیەکی هەمیشەییدان لە ئەنجامی سوڕانەوەی زەوی و هەسارەکانی تر بە دەوری خۆردا جێگاکەیان لە ئاسمان دا بە بەردەوامی دەگۆڕێ لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت هەسارە گەڕۆکەکان. زەوی چەند جووڵەیەکی هەیە لەوانە، جووڵەی ڕۆژانە، و جووڵەی ساڵانە.

### ١- جووڵەی ڕۆژانە:

زەوی بە دەوری تەوەرە لارەکەی خۆیدا هەمیشە بەرامبەر بە خۆر دەسووڕێتەوە کە لارییەتێکەی (٢٣,٥) پلەیە لەسەر ئاستی ئەو ستوونەی هاتۆتە خوارێ و بۆیەك لایەو نەگۆڕە وەمەبەست لە تەوەری زەوی ئەو هێڵە خەیاڵییەیە کە بە ناوجەرگی زەوی دا تێدەپەڕێ و هەردوو جەمسەری باکوور و باشوور بەیەك دەگەیەنێ سووڕێکی تەواوی خولانەوەش بە (٢٤) کاتژمێر تەواو دەکات، بەڵام ئێمە هەست بەم جووڵانەوەیە ناکەین لەبەر ئەوەی زەوی و هەرچی لەسەر ڕووی زەوییە بۆ یەك لاو بەیەك خێرایی دەجووڵێن لەئەنجامی جووڵەی ڕۆژانەی زەویدا دیاردەی بە دوای یەکدا هاتنی شەوو ڕۆژ پەیدا دەبێت و ئەم دیاردەیەش لەبەر ئەم هۆیانە ڕوودەدات:

أ- شێوە گۆییەکەی زەوی.

ب- سووڕانەوەی زەوی بە تەوەرەکەدا هەمیشە لاری ئەم تەوەرەیە بۆ لایەکە.

جـ- بەردەوامی سەرچاوەی ڕووناکی (خۆر).

ئەگەر زەوی جێگیر بووایە واتە نەسووڕایەتەوە نیوە ڕووناکەکەی (ڕۆژ) دەبوو وە نیوەکەی تری تاریك (شەو) دەبوو.

لەو بازنـە پانیـە سـەرەکیانەی کـە لـە لێکۆڵینـەوەکانی ئـاوو هـەوادا بـە کەڵکە، بازنەی هێڵی یەکسانی، بازنەی پانی ٢٣,٥° بـاکوور کـە بـە خولگـەی قرژاڵ دەناسرێت، وە بازنەی پـانی ٢٣,٥° باشـوور کـە بـە خولگـەی کارژۆڵـە دەناسـرێت، هـەروەها هـەردوو بازنـەی جەمـسەرەکان، (٩٠°) بازنـەی پـانی ٦٦,٥ باکوور کە بە بازنەی جەمسەری بـاکوور دەناسـرێت، وە بازنـەی پـانی ٦٦,٥ باشـوور کـە بـە بازنـەی جەمـسەری باشـوور دەناسـرێت، (بڕوانـە وێنەی ژمارە (٨) .




شێوەی ژمارە (٦)

وێنەی شەو و ڕۆژ

## ٢- جووڵەی ساڵانە:

لـە کاتێکـدا زەوی بـە دەوری خـۆردا دەسـووڕێتەوە لـە جێگـای خـۆی ناوەستێت بەڵکو لەسەر خولگەیەکی جێگیر بە دەوری خـۆردا دەسـوڕێتەوە، ئەم خولانەوەیەش بە ساڵێك تەواو دەکات. ئەوەی تێبینـی دەکرێـت ئەوەیـە کە تیشکی خۆر بە ستوونی لەسەر هێڵی یەکسان نامێنێتـەوە بـەڵکو تیـشکە ستوونەکەی لە نێوان هەردوو خولگەی قرژاڵ و کارژۆڵە بە درێژایی ساڵ دێـت و دەچێت ئەویش بە هـۆی لاری تـەوەری زەوییـەوە وەك لـە پێـشتر باسمـان کرد بەم دیاردەیەش دەگوترێت (بزووتنەوەی بە ڕواڵەتی خـۆر) لـە ئـەنجامی جووڵانەوەی ساڵانەی زەویدا دیاردەی چوار وەرزە پەیدا دەبێت.

**دەتوانین هۆیەکانی ڕوودانی چوار وەرزی ساڵ لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:**

أ- سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا بە ٣٦٥ ڕۆژو ٦ کات ژمێردا.

ب- هێڵکەیی ئـەو خولگەیـەی کـە زەوی لەسـەری دەسـووڕێتەوە بـە دەوری خۆردا.

جـ- لارێتی تـەوەری زەوی (دۆخـی زەوی) بـە ڕێـژەی (٢٣,٥) پلـە . بڕوانـە وێنەی ژمارە (٩)

بە دوایەکدا هاتنی چوار وەرزی ساڵ لەسەر دوو نیـوە گـۆی زەوی ڕوون دەکاتەوە.




شێوەی ژمارە (٧)

چوار وەرزی ساڵ

## بازنەکانی پانی و هێڵەکانی درێژی:

### ١- بازنەکانی پانی:

ئەو بازنە خەیاڵییە نەبینراوانەن کە دەوری گۆی زەوییان داوە ژمارەیان ١٨٠ بازنەیە، ٩٠ بازنە لە نیوە گۆی باکوور، ٩٠ بازنەی تریش لە نیوە گۆی باشوور، سوودی ئەم بازنانە بۆ زانینی هەرێمەکانی ئاووهەوایە لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی.

### * تایبەتمەندی بازنەکانی پانی:

أ- بازنەکانی پانی بازنەی تەواون دەوری گۆی زەوییان داوە.

ب- وشەی باکوورو باشوور لەگەڵ بازنەکانی پانیدا بەکاردەهێنرێت وەك ئەوەی بڵێین بازنەی پانی ٤٠° باکوور یان ٤٠° باشوور.

جـ- هەتا لە هێڵی یەکسانییەوە بەرەو جەمسەرەکان بڕۆین چێوەی ئەو بازنە بچووك دەبێتەوە، کەواتە گەورەترین بازنە هێڵی یەکسانیەو بچووکترینیشیان بازنەی ٩٠°.

د- بازنەکانی پانی تەریبن بە یەکتری واتە هەتا درێژییان بکەینەوە بەیەکتر ناگەن.

هـ- تەنها هێڵی یەکسانی بە هێڵی سفر یان هێڵی بناغە دادەنرێت هیچ هێڵێکی تر جێگەی ناگرێتەوە، چونکە گەورەترین بازنەیەو گۆی زەوی دەکات بە دوو بەشی یەکسانەوە.




شێوەی ژمارە (٨)

بازنەکانی پانی

- گرنگترین ئەو بازنانەی بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی کەشوهەوا بریتییە لە هێڵی یەکسانی، بازنەی ٢٣،٥ باکوور و کە بەخولگەی قرژاڵ ناسراوە و بازنەی ٢٣،٥ باشوور بە خولگەی کارژۆلە ناسراوە، هەروەها بازنەی ٦٦،٥ باکوور و باشوور بە بازنەکانی جەمسەری ناسراوە.

## ٢- هێڵەکانی درێژی:

لە ڕاستیدا نیوە بازنەن یان کەوانەن، ئەمانیش هەر خەیاڵین لەسەر گۆی زەوی کێشراوون، هەردوو جەمسەری باکوور و باشوور بەیەکتری دەگەیێنن، ژمارە یان ٣٦٠ هێڵە ١٨٠ لەبەری خۆرهەڵات و ١٨٠ تریش لەبەری خۆرئاوا، سوودی ئەم هێڵانە بۆ زانینی (کات)ە لە ناوچە جیاوازەکانی سەر گۆی زەوی.

سوودی هەردوو کۆمەڵەکەش بەیەکەوە بۆ دۆزینەوەی شوێنە لەسەر گۆی زەوی.




شێوەی ژمارە (٩)
هێڵەکانی درێژی

## نیشانەکانی هێڵەکانی درێژی:

أ- نیوە بازنەن لە جەمسەرەکاندا بەیەکدەگەن، واتە تەریب نین بەیەکتری.

ب- وشەی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان لەگەڵدا بەکاردەهێنرێت چونکە ئەمانیش وەکو بازنەکانی پانی ژمارەکانیان دووبارە دەبێتەوە، کە دەڵێین هێڵی ٤٠ دەبێت دیاری بکەین ٤٠ی خۆر هەڵاتە یان خۆرئاوا.

جـ- لە هێڵەکانی درێژیدا هەر هێڵێك بگرێت بۆی هەیە بێتە هێڵی سفرو ببێتە بناغە بۆ دابەشکردنی هێڵەکانی تر، ئێستاکە هێڵی سفر - ئەو هێڵەیە کە بە ڕوانگە گەردونیەکەی (گرینویچ) ی نزیك لەندەندا تێدەپەڕێت - کراوەتە بناغە ئەوە بەڕێکەوتنی نێوان دەوڵەتان بووە.

## پەیوەندی نێوان هێڵەکانی درێژی و کات:

وەك دەزانرێت گۆی زەوی کە بە دەوری تەوەرەکەی خۆیدا دەسووڕێتەوە، بە ٢٤ کاتژمێر سووڕێك تەواو دەکات سووڕانەوەکەشی لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵاتە، بیرۆکەی پێوانەکردنی کاتی شارو ناوچەکان لەسەر ئەمەوە دروست بووە زەوی سووڕەکە بە ٢٤ سەعات تەواو دەکات، واتە لەو ماوەیەدا هەموو هێڵەکانی درێژی بە بەردەمی تیشکی خۆردا تێدەپەڕن، کەواتە لەماوەی ٢٤ سەعاتدا ٣٦٠ هێڵی درێژی بە بەردەمی تیشکی خۆردا تێدەپەڕێت. ئایا بە سەعاتێك چەند هێڵ تێدەپەڕێت؟ وەڵامەکەی ٣٦٠÷٢٤= ١٥ هێڵ مانای وایە بە سەعاتێك ١٥ هێڵ بە بەردەمی تیشکی خۆردا تێدەپەڕێت، گەر بە یەك سەعات ١٥ هێڵ تێپەڕێت ئایا یەك هێڵ بە چەند تێدەپەڕێت ٦٠ ÷ ١٥ = ٤ دەقیقە زەوی لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات دەسووڕێتەوە کەواتە ناوچە خۆرهەڵاتییەکان لەکاتی خۆرهەڵاتندا زووتر خۆریان لێهەڵدێت لەچاو ناوچە خۆر ئاواییەکان، بە مانایەکی تر ناوچە خۆرهەڵاتییەکان کاتیان لە پێشترە لەچاو ناوچە خۆرهەڵاتییەکان بۆ هەر هێڵێکی درێژی ماوەی (٤) دەقیقەیە، بڕوانە وێنەی ژمارە (٦) و ژمارە (٧).

# زاراوەکـــــان

| | |
|---|---|
| ١- مانگ | Moon |
| ٢- خۆر | Sun |
| ٣- گەرمی | Heat |
| ٤- ڕووناکی | light |
| ٥- ئەستێرە | Star |
| ٦- هەسارە | Planet |
| ٧- سووڕاندنەوەی زەوی | Rotation of Earth |
| ٨- وەرز | Season |
| ٩- بازنەکانی پانی | Parallet latitude |
| ١٠- هێڵەکانی درێژی | Meridians latitude |
| ١١- هێڵی یەکسانی | Equator |
| ١٢- خولگەی قرژاڵ | Tropic of cancer |
| ١٣- خولگەی کارژۆڵە | Tropic of capricorn |
| ١٤- بازنەی جەمسەریی باکوور | Arctic Circle |
| ١٥- بازنەی جەمسەریی باشوور | Antarctic Circle |
| ١٦- جەمسەری باکوور | North pole |
| ١٧- جەمسەری باشوور | South pole |

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

پ١/ پێناسەی ئەمانە بکە:

١- بازنەکانی پانی. ٢- هەسارە گەڕۆکەکان. ٣- تەوەرەی زەوی.

پ٢/ ڕاست و هەڵەی ئەمانەی خوارەوە دیاری بکەو هەڵەکانیش ڕاست بکەرەوە:

١- پێشکەوتنی زانیاری ئەوەی چەسپاندووە کە شێوەی زەوی بە تەواوی خڕە.

٢- سووڕاندنەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا وەك خولاندنەوەی میلی کات ژمێرە.

٣- هەتا بەرەو باکوورو باشووری هێڵی یەکسان بڕۆین چێوەی بازنەکانی پانی بچووك دەبنەوە.

٤- سوودی بازنەکانی پانی بۆ دۆزینەوەی شوێن و کاتە لەسەر گۆی زەوی.

٥- هەسارە گەڕۆکەکان گەرمی و ڕووناکی لە خۆرەوە وەردەگرن.

پ٣/ هۆی ئەمانەی خوارەوە دیاری یکە:

١- تیشکی خۆر بە ستوونی و نیمچە ستوونی لەنێوان هەردوو خولگەی قرژاڵ و کارژۆڵەدا بە درێژایی ساڵ دێت و دەچێت.

٢- هەست نەکردن بە جووڵەی زەوی.

٣- بوونی ژیان لەسەر زەوی.

پ٤/ ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:

١- دووری زەوی لە خۆرەوە بە پلەی ............ دێت لە دوای هەردوو هەسارەی ............ و ............

٢- ژمارەی هەسارە گەڕۆکەکان کە بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە ............ کە نزیکترینیان لە خۆرەوە ............ وە دوورترینیان ............ .

٣- لە ئەنجامی جوولەی سالآنەی زەوی‌دا دیاردەی ............ پەیدا دەبێت، لە ئەنجامی جوولەی ڕۆژانەی زەوی دا دیاردەی ............ پەیدا دەبێت.

پ٥/ بەدوایەکدا هاتنی چوار وەرزی ساڵ لە هەردوو نیوە گۆی زەوی باس بکەو پاشان بە وێنە ڕوونی بکەرەوە:

پ٦/ جیاوازی نێوان هێڵەکانی درێژی و بازنەکانی پانی چی‌یە ؟ بە وێنە ڕوونی بکەرەوە:

## بەشی سێیەم
## سروشتی پێکهاتەی توێکڵی زەوی

وەك دەزانرێت ماددە لە سرووشتدا بە سێ شێوە دەبینرێت ئەوانیش ڕەق و شل و گازە، بەرگەکانی زەویش ئەم (٣) شێوەیەیان وەرگرتووە، کەواتە دەتوانین بڵێین زەوی بەم بەرگانە دەورە دراوە:

### ١- بەرگی رەق (بەرگی بەردین):

ئەمە ڕووبەرە وشکانیەکەی گۆی زەوییە واتە کیشوەرەکانە، پێکهاتووە لە تاشە بەرد کە هەندێکی لە ئەنجامی بە تێپەربوونی کات وردبووەو بۆتە خاك، ئەو خاکەش زۆرینەی بەرگە ڕەقەکەی داپۆشیوە، ڕێژەی ئەم بەرگە دەگاتە نزیکەی ٣٠٪ ڕووبەری گۆی زەوی.

### ٢- بەرگی ئاوی:

ئەو بەشە نزمەی گۆی زەوییە کە ئاو دایپۆشیوە کەواتە مەبەست لەم بەرگە زەریاو دەریاو دەریاچەکانە ڕووبەرێکی گەورەی گۆی زەوی داگیر کردووە دەگاتە نزیکەی لە ٧٠٪ی ڕووبەری گۆی زەوی.

### ٣- بەرگی گازی:

ئەو بەرگەیە کە دەوری هەموو گۆی زەوی داوە بە وشکانی و ئاوەوە، لەبەر ئەوەی زۆرینەی هەرە زۆری پێکهاتەکەی گازە وەکو گازی نایترۆجین و ئۆکسجین و دووانە ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو بۆیە بەو ناوە ناو نراوە.

### ٤- بەرگی زیندەگی:

ئەم بەرگە لە ڕاستیدا بوونی نییە بەڵام لە تێکەڵەی ئەو (٣) بەرگەی سەرەوە دروست بووە، بۆتە مایەی دروست بوونی ژیان لەسەر گۆی زەوی

وەکو ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك، هەر لەبەر ئەمەشە ناونراوە بەرگی زیندەگی.

## دابەشبوونی گشتی وشکانی و ئاو:

وشکانی و ئاو ڕووی گۆی زەوییان پێکهێناوە، وشکانی ئەو ڕووبەرانەی گۆی زەویین کە بەرزترن لە ئاستی ڕووی دەریاو ئاو داینەپۆشیون بەو ڕووبەرانەش دەگوترێت کیشوەرەکان (قارات) هەرچی ئاویشە ئەو ناوچە نزمە فراوانانە دەگرێتەوە کە پێیان دەگوترێت زەریا و دەریا و دەریاچەکان.

## تایبەتمەندییەکانی دابەشبوونی وشکانی و ئاو:

گەر سەیری نەخشەی ژمارە (٧) و ژمارە (٨) بکەین کە دابەشبوونی وشکانی و ئاوی سەرگۆی زەوی پیشان دەدات ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە:

١- ڕووبەرە وشکانیەکەی گۆی زەوی لە ڕووبەرە ئاوییەکەی کەمترە چونکە ڕووبەرە وشکانیەکە دەوروبەری ٣٠٪ی ڕووی زەوی داپۆشیوە بەڵام ڕووبەرە ئاویەکە لە نزیکەی ٧٠٪ی گۆی زەوی داپۆشیوە.

٢- زۆرینەی وشکانیەکە کەوتۆتە نیوە گۆی باکووری زەوییەوە لە ٥٢٪ی نیوە گۆی باکووری زەوی وشکانیە، تەنها لە ٤٨٪ی ئاو داپۆشیوە، بەڵام ئەو دابەشبوونە لە نێوە گۆی باشووری زەویدا پێچەوانە بۆتەوە، ڕێژەی ڕووبەرە ئاوییەکەی دەگاتە ٩٤٪ بەڵام ڕێژەی ڕووبەرە وشکانیەکەی تەنها لە ٦٪.

٣- بەشە وشکانییەکان لە نیوە گۆی باکووردا وا دەردەکەون کە پێکەوە بەستراون بەڵام لە نیوە گۆی باشووردا لەیەکتری دوور دەکەونەوە.




نەخشەی ژمارە (٧)

دابەشبوونی ئاوو وشکانی لە جیهاندا

نیوە گۆی وشکانی زەوی نیوە گۆی ئاویی زەوی



نەخشەی ژمارە (٨)

دابەشبوونی وشکانی و ئاو لە هەردوو نیوە گۆی زەوی

### ١- بەرگی ڕەق (بەرگی بەردین):

کیشوەرەکان ئەو بەشە (وشکانیە فراوانەیە کە لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزترە، ئەو کیشوەرانەی کە بەشە وشکانیەکەی گۆی زەوی پێکدێنن بریتین لە (٧) کیشوەر کە ئاسیا گەورەترینیانە ئوستترالیاش بچووکترینیان، (بڕوانە خشتەی ژمارە (١)).

### ناوی کیشوەرەکان و ڕووبەرەکانیان:

| ز | ناوی کیشوەر | ڕووبەرەکەی بە کم٢ |
|---|---|---|
| ١ | ئاسیا | ٤٤٤١٣٠٠٠ |
| ٢ | ئەفەریقیا | ٣٠٣١٩٠٠٠ |
| ٣ | ئەمەریکای باکوور | ٢٤٢٤٧٠٠ |
| ٤ | ئەمەریکای باشوور | ١٧٨٣٤٠٠٠ |
| ٥ | جەمسەری باشوور (ئەنتراکتیکا) | ١٣١٨٠٠٠٠ |
| ٦ | ئەوروپا | ١٠٥٢٧٠٠٠ |
| ٧ | ئوسترالیا | ٨٥١١٠٠ |

خشتەی ژمارە (١)

**تێبینی**: ئەم خشتەیە تەنها بۆ زانیاریە، نەوەک بۆ لەبەرکردن.

## بەرزو نزمی ڕووی زەوی ( تۆپۆگرافیای زەوی ):

بەرز نزمی رووی کیشوەرکان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە، ئەو ڕۆاڵەتانەش بەپێی ئاستی رووی ئاوی دەریا و زەریاکان دەپێورێت. بەم شێوانەی خوارەوە دەبێت :

### أ- دەشتەکان:

ئەو زەوییانەن کە بە زۆری ڕووەکانیان تەختەو لە ئاستی ڕووی دەریاوە هێندە بەرزنین، وردە وردە بەرز دەبنەوە بە جۆرێك لـە دەشـتـە فراوانەکانـدا هەسـتـی پێناکـەن، وەکـو دەشـتـەکانی ڕافیـدەین لـە عێـراق و شـارەزوور لـە هەرێمی کوردستان.



وێنەی ژمارە (١٠)

وێنەی دەشتێک لە هەرێمی کوردستان

## ب- دۆڵەکان:

ئەو زەوییە نزمە تەسکە لاکێشانەیە کە لە نێوان بەرزاییەکاندا درێژ دەبنەوە، لەگەڵ دروست بوونی چیاکاندا دروست بوون، یان بەهۆی داکشان و رۆچوون وداچوون. نمونەش بۆ ئەمە دۆڵی (خەرەند) لە رەواندوز.

## ج- بانەکان:

ئەو زەوییە بڵندانەن کە ڕووەکەیان تەختە و لاپاڵەکانیان لە زۆرینەی لاکانیانەوە لێژن، هەندێك جار لەسەر ڕووەکانیان دۆڵ و چیاو گرد هەیە، نموونەش بۆ بانەکان، بانی (تبت) لە ئاسیاو کە بەرزترین و فراوانترین بانە لە جیهاندا .

## د- گردو چیاکان:

گردەکان ئەو زەوییە بڵندانەن کە لاپاڵەکانیان زۆر لێژنین وەکو گردەکانی (حەمرین) کە سنوری سروشتی باشوری هەرێمی کوردستانە.
چیاکان: زەوییەکی بڵندن کە هەندێك جار بەرزییەکەی لە (١٠٠٠م) لەچاو زەوییەکانی دەوروبەری، لووتکەکانیان تیژن و لاپاڵەکانیان لێژن، هەندێك جار چیاکان بەیەکەوە دەبن وەکو زنجیرە یەك.
زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و پیرەمەگرون لە هەرێمی کوردستانی عێراق و چیاکانی هیمالایا لە ئاسیادا. وە هەندێك چیاش تەنها دەردەکەون جیاوازی لە نێوان چیاو گردا لە بەرزییەکەیان و لێژی لاپاڵەکان و تیژی لووتکەکانیاندایە.



وێنەی ژمارە (١١)

وێنەی گرد (تەپۆڵکە) لە هەرێمی کوردستان



وێنەی ژمارە (١٢)

وێنەی زنجیرەی چیا لە هەرێمی کوردستان

## ٢- بەرگی ئاوی:

ڕووبەرێکی ئاوی زۆر فراوان و قووڵن و دەوری کیشوەرەکانیان داوە، ئاوەکەیان وەستاو نییە بە شێوەی تەووژم دەجولێت، گەورەترینیان زەریای (هێمن) بچووکترینیشیان زەریای بەستووی باکوورە.

بڕوانە خشتەی ژمارە (٢).

### زەریاکان و ڕووبەرەکانیان:

| ز | ناوی زەریا | ڕووبەرەکەی ملیۆن کم٢ |
|---|---|---|
| ١ | پاسفیك (هێمن) | ١٦٥ |
| ٢ | ئەتڵەسی | ٨٢ |
| ٣ | هیندی | ٧٣ |
| ٤ | بەستووی باکوور | ١٤ |

خشتەی ژمارە (٢) تێبینی

دەریا هەر وەك زەریا وایە، بەڵام ڕووبەرەکەی بچووکترەو دەوڵەتان و بەشەکانیان لێکجیا دەکاتەوە، ئەوانیش دەکرێن بە چەند بەشێکەوە گرنگترینیان ئەمانەن:

**أ- دەریا دەرەکیەکان:** **(البحار الخارجية)**:

ئەو ڕووبەرە ئاوییانەن کە کەوتوونەتە نێوان کەناری کیشوەرەکان و ئەو کۆمەڵە دورگەو نیمچە دورگەیانەی کە لەزەریاکان جیای دەکاتەوە وەکو دەریای چین و دەریای عەرەب.

### ب– دەریا ناوەکیەکان: (البحار الداخلية):

ئەو ڕووبەرە ئاویانەن کە کەوتوونەتە ناو کیشوەرەکانەوە، بە گەرووی تەنگ بە زەریاکان دەگەن، وەکو دەریای ناوەڕاست و دەریای سوور.

### ج– دەریا داخراوەکان: (البحار المغلقة):

ئەو ڕووبەرە ئاوییانەن کە لە هەموو لایەکەوە بە وشکانی دەورە دراون و بە زەریاکان ناگەن، وەکو دەریای مردوو، دەریای قزوین.

## گرنگی دەریاو زەریاکان:

١– زەریا و دەریاکان ڕێگەی گواستنەوەی هەرزان و ئاسانن بۆ گواستنەوەی شمەك و هاتوچۆ بەکاریان دەهێنێت.

٢– بەسەرچاوەیەکی گەورەی ڕاوەماسی دادەنرێت کە بەشێکی باشی خۆراکی دانیشتوانی جیهانی پێکهێناوە.

٣– زۆر دەرامەتی تێدایە وەکو نەوت، خوێ، ئەسفەنج،مرواری

٤– کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر ئاووهەوای ناوچەکانی دەوروبەری.

## ٣- بەرگی گازی:

بەرگە گازەکەش بەشێکە لە زەوی وەکو بەرگە ئاوەکە و بەرگە ڕەقەکە، گرنگیەکی زۆری هەیە ناهێڵێت هەموو تیشکە زیان بەخشەکان بگەنە سەر زەوی، زەوی دەپارێزێت لەبەرزبوونەوە و نزم بوونەوەی زۆری پلە گەرمی، دەنگ و شەپۆلەکانی پێدا دەگوێزرێتەوەو ڕووناکی ڕۆژ پێکدەهێنێت، ئەم بەرگە لە چەند گازێك پێکهاتووە لەوانە نایترۆجین ٧٨٪ و ئۆکسجین ٢١٪ واتە هەر بە تەنها بەو دوو گازە ٩٩٪ی پێکهاتەی ئەو بەرگە پێکدێنن،

گازەکانی ترو کەرەسە ڕەق و شلەکانی ناو ئەو بەرگە تەنها ١٪ بەرگەکە پێکدێنن، لە چەند چینێکی ئەستوورایی جیاواز پێکهاتووە.

لەناو ئەم بەرگەدا گۆڕانەکانی کەش و ئاووهەوا ڕوودەدات لەبەر گرنگی ئەو بابەتەو کاریگەرییەکانی لەسەر چالاکییەکانی مرۆڤ کەمێك بە درێژی تر باس لەو بەرگە دەکەین ئەویش لە ڕێگەی باسکردنی کەش و ئاوو هەواوە.

## (( ئاووهەوا ))

## کەش: ( الطقس ):

باری ئەو بەرگە گازەیە کە دەوری گۆی زەوی داوە لە ڕووی پلەی گەرمی، پەستانی هەوا، با، شێ و داباریندەوە، بۆ ماوەیەکی کورت لە شوێنێکی دیاریکراودا، وەك ئەوەی بڵێین کەشی ئەمڕۆی شاری هەولێر ساردو بارانە.

## ئاووهەوا: ( المناخ ):

تێکڕای باری ئەو بەرگە گازەیە کە دەوری گۆی زەوی داوە لە ڕووی پلەی گەرمی، پەستانی هەوا، با، شێ و داباریندەوە بۆ ماوەیەکی درێژ لە شوێنێکی دیاریکراودا، وەك ئەوەی بڵێین ئاوو هەوای ناوچە شاخاوییەکانی هەرێمی کوردستان زستانی ساردو بە باران و هاوینی مام ناوەندی وشکە، لە ئەنجامی ئەو دوو پێناسەیە کورتەی کەش و ئاوو هەواوە بۆمان دەردەکەوێت، کە لە یەکچوون و جیاوازی لە نێوان ئەو دووانەدا هەیە، لەوەدا یەکدەچن، کە هەردووکیان لە بەرگە گازەکە دەکۆڵنەوە لە ڕووی ئەو چوار ڕەگەزە هاوبەشەی نێوانیانەوە بەڵام لەوەدا جیاوازن کەش لە بارودۆخە هەنووکەییەکەی بەرگە گازەکە دەکۆڵێتەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی ئاوو هەوا بۆ ماوەیەکی دورو درێژەو تێکڕاکانی باری کەشە.

## ڕەگەزەکانی کەش و ئاوو هەوا :

کەش و ئاو و هەوا لە چوار (٤) ڕەگەز دەکۆڵنەوە گەر بە پێی گرنگی ڕیزیان بکەین ئەمانەن:

١- پلەی گەرمی. ٢- پەستانی هەوا.

٣- بـــــا. ٤- شێ و داباریین.

لەبەر گرنگی ئەو بابەتە کەمێك بە درێژی تر لەسەر هەریەکەیان دەدوێین.

### ١- پلەی گەرمی :

بە ڕەگەزی یەکەمی کەش و ئاووهەوا دادەنرێت لە هەموویان گرنگترەو کار لەوانی تریش دەکات، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی هەموو زیندەوەرەکانی سەر گۆی زەوییەوە هەیە کاردەکاتە سەر تەندروستی و گشت چالاکیەکانی مرۆڤ وەك کشتوکاڵ، ئاژەڵداری و بازرگانی و پیشەسازی.

**أ- سەرچاوەکانی گەرمی:**

خۆر بە سەرچاوەی هەرە گەورەی گەرمی هەوای سەر گۆی زەوی دادەنرێت بە شێوەی وزە لە ڕێگەی تیشکەوە دەگاتە سەر زەوی پاش ئەوەی ڕووی زەوی بڕێکی لێدەمژێت ئەوی تری دەداتەوە بەوەش هەوای دەوروبەری گۆی زەوی گەرم دەبێت، جگە لە خۆر ناوجەرگەی زەویش بڕێکی زۆر کەم گەرمی دەدات بە بەرگە گازەکە ئەویش لە ڕێگەی گڕکان و فوارە گەرمەکانەوە، بڕێکی زۆر کەمی ئەو گەرمییەش دەستکردی مرۆڤە، کە سووتەمەنی بەکاردەبات بۆ پیشەسازی خۆ گەرم کردن و پێداویستیەکانی تری ژیانی ڕۆژانەی.

ب- ئەو هۆیانەی کار لە پلەی گەرمی هەواکە دەکەن:

ئەو بڕە گەرمییەی کە لە تیشکی خۆرەوە بەرهەم دێت لە هەموو ناوچەیەك و لە هەموو کاتێکدا وەك یەك نیە، ناوچە هەیە ساردە، هەیە مام ناوەندییە، هەیە گەرمە، هەروەها بە گوێرەی کاتیش دەگۆڕێت، وەك جیاوازی نێوان پلەی گەرمی زستان و هاوین و شەو ڕۆژ، هۆی ئەو جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

**١- گۆشەی تیشکی خۆرکەوتن:**

مەبەست لەوە پێوانەی ئەو گۆشەیەیە کە تیشکی خۆرەکە لەگەڵ زەویدا دروستی دەکات، هەتا گۆشەکە ستوون و مەیلەو ستوون بێت ناوچەکە زۆرتر گەرم دەبێت بە پێچەوانەوە هەتا گۆشەکە لارو مەیلەو لار بێت ناوچەکە کەمتر گەرم دەبێت ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

أ- تیشکی ستوون ماوەیەکی کەمتر دەبڕێت تا دەگاتە سەر زەوی، واتە لە ڕێگا کەمتر گەرمی بزر دەکات بە پێچەوانەی تیشکی لارەوە کە ماوەیەکی زۆرتر دەبڕێت و گەرمی زۆرتر بزر دەکات.

ب- تیشکی ستونی لە ڕووبەرێکی بچووکدا کۆ دەبێتەوەو زۆرتری گەرم دەکات، بەڵام تیشکی لار لە ڕووبەرێکی گەورەتردا کۆ دەبێتەوە و کەمتری گەرم دەکات.(بڕوانە شێوەی ژمارە (١٣).




وێنەی ژمارە (١٣)

تیشکی لارو تیشکی ستوون

### ٢- كورت و درێژی ڕۆژ:

هەتا ڕۆژ درێژتر بێت بڕێکی زۆرتر گەرمی لە تیشکی خۆرەوە بەرهەم دێت ئەمەش لە ڕۆژ درێژیی هاوینی کوردستاندا بە ئاشکرا هەستی پێدەکرێت، درێژی ڕۆژی هاوین لە وڵاتی ئێمەدا دەگاتە نزیکەی ١٤ سەعات، بە پێچەوانەی ڕۆژی زستانەوە کە کورتەو دەگاتە نزیکەی ١٠ سەعات بەوەش ناوچەکە کەمتر گەرم دەبێت.

### ٣- پاکژی هەوا:

هەتا هەواکە پوخت و پاکژ بێت بڕێکی زۆرتر تیشکی خۆر دەگاتە سەر زەوی، گەر هەواکە پاکژ نەبوو تەپ و تۆزو گەردیلەی ڕەق و شل و هەڵمی ئاوی زۆرتر تێدابوو ئەوانە بەردەگرن لە تیشکی خۆر و گەرمی بەرهەم هێنانیش کەم دەکەنەوە.

لە ئەنجامی ئەو هۆکارانەی باسکرا دەردەکەوێت کە ناوچەکانی سەر گۆی زەوی گەرمییان وەك یەك نییە بۆیە دەتوانین لە ڕووی گەرمییەوە گۆی زەوی دابەشبکەین بەسەر ئەم ناوچانەی خوارەوەدا:(بڕوانە شێوەی ژمارە (١٤).




شێوەی ژمارە (١٤)
ناوچەکانی گەرمی سەر گۆی زەوی

## ١- ناوچەی گەرم:

دەکەوێتە نێوان هەردوو خولگەکەوە، خولگەی قرژاڵ لە باکوورو خولگەی کارژۆڵە لە باشوور، واتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٢٣,٥° باکوور و باشوور، بە درێژایی ساڵ لەم ناوچانەدا و بە شێوەیەکی گشتی پلەی گەرمی بەرزە چونکە تیشکی خۆر بە شێوەیەکی ستوون یان نیمچە ستوون دەدات لەم ناوچانە.

## ٢- دوو ناوچەی فێنك:

**أ- ناوچەی فێنکی باکوور:** بەشێوەیەکی گشتی دەکەوێتە نێوان خولگەی قرژاڵ و بازنەی جەمسەری باکوورەوە، واتە نێوان هەر دوو بازنەی پانی ٢٣,٥- ٦٦,٥ باکوور.

**ب- ناوچەی فێنکی باشوور:** بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە نێوان خولگەی کارژۆڵەوەو بازنەی جەمسەری باشوورەوە، واتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٢٣,٥ – ٦٦,٥° باشوور.

هۆی فێنکی ئەم ناوچانەش دەگەڕێتەوە بۆ لارێتی تیشکی خۆر.

## ٣- دوو ناوچەی سارد:

**أ- ناوچەی ساردی باکوور:** دەکەوێتە نێوان بازنەی جەمسەریی باکوور و جەمسەری باکوورەوە واتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٦٦,٥° – ٩٠° باکوور.

**ب- ناوچەی ساردی باشوور:** دەکەوێتە نێوان بازنەی جەمسەریی باشوورو جەمسەری باشوورەوە واتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٦٦,٥–٩٠ باشوور.

هۆی ساردی ئەم ناوچانەش لارێتی زۆری تیشکی خۆرە.

## پێوانی پلەی گەرمی:

گەرمی بە پلە پێوانە دەکرێت، لە وڵاتی ئێمە ڕەچاوی پلەی سەدی دەکرێت سفر پلەی بەستنی ئاوەو ١٠٠ پلەی کوڵانێتی، کە دەگوترێت پلەی گەرمی ناوچەیەك لە کاتێکی دیاریکراودا بۆ نموونە ٣٠° سەدییە ئەوە پلەی گەرمی ئەو هەوایەیە کە لە سێبەردا تۆمار کراوە، هەوایەکە جووڵەکەی ئازادەو لە بەرزایی ١,٥–٢ مەتردا تۆمار کراوە.

ئەو ئامێرانەی کە پلەی گەرمی تۆمار دەکەن گەلێ شێوەو جۆری جیاوازیان هەیە (بڕوانە وێنەکانی ژمارە ١٥ – ١٦ – ١٧).



أ/ گەرمی پێوی بەرزترین پلە.　　وێنەی ژمارە (١٥)



ب/ گەرمی پێوی نزمترین پلە　　وێنەی ژمارە (١٦)



وێنە ژمارە (١٧)

ج/ گەرمی پێوی تۆمارکەر = ثیرمۆگراف

## ٢- پەستانی هەوا:

ئەو بەرگە گازەی کە دەوری گۆی زەوی داوە ماددەیە و بۆشایی داگیر کردووە بارستایی و کێشی هەیە، بەو کێشە دەگوترێت هەوا، کەواتە پەستانی هەوا بریتیە لە کێشی ستوونێك هەوا لە کۆتایی بەرگە گازەکەوە هەتا ئاستی ڕووی دەریا، ئەوەش یەکسانە بە کێشی ستوونێك لە جیوە کە بەرزاییەکەی ٧٦سم لەسەر یەك سانتیمەتر دووجا.

### أ- ئەو هۆیانەی کار لە پەستانی هەوا دەکەن:

پەستانی هەوا دەگۆڕێت لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی ترو لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر هۆی ئەو گۆڕانەش دەگەڕێتەوە بۆ:

١- **پلەی گەرمی:** پەیوەندی نێوان پلەی گەرمی و پەستانی هەوا پەیوەندییەکی پێچەوانەیە، هەتا پلەی گەرمی ناوچەیەك بەرزبێتەوە پەستانەکەی نزم دەبێتەوە، چونکە هەواکە زیاتر دەکشێت و

لێکدووردەکەوێتەوەو کێشەکەی کەم دەکات، هەتا نزمیش ببێتەوە پەستانەکەی بەرز دەبێتەوەو کێشەکەی زۆرتر دەبێت.

**٢- هەڵمی ئاو:** پەیوەندی نێوان هەڵمی ئاوو پەستانی هەوا دیسان پێچەوانەیە واتە هەتا هەڵمی ئاو لە هەوادا زۆرتر بێت، پەستانی هەواکە نزم دەبێتەوە، چونکە هەڵمی ئاو سووکترە لە هەوا.

**٣- بەرزو نزمی لە ئاستی ڕووی دەریاوە:**

هەتا لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرز ببینەوە پەستانی هەوا نزم دەبێتەوە، چونکە لەلایەك درێژی ستوونە هەواکە کورت دەبێتەوە لەلایەکی تریشەوە چینەکانی سەرەوەی هەوا کێشیان کەمترە بەڵام بە نزم بوونەوە لە ئاستی ڕووی دەریا، پەستانی هەواکە بەرز دەبێتەوە، چونکە ستوونە هەواکە درێژ تر دەبێت و گازو پێکهاتە قورسەکانیش لەوێدا زۆرتر دەبن.

**٤- تەوژمی هەوا:** واتە بزوتنەوەی هەوایە، گەر لە خوارەوە بۆ سەرەوە بوو، پێی دەگوترێت (تەوژمی سەرکەوتوو) گەر لە سەرەوە بۆ خوارەوە بوو پێی دەگوترێت (تەوژمی داکەوتوو) هەر ناوچەیەك تەوژمی هەوای داکەوتووی هەبێت پەستانی هەواکەی بەرزدەبێتەوە، چونکە وەك وایە هەوا لەو ناوچەیەدا کۆ ببێتەوەو کەڵەکە بێت، بەڵام بوونی تەوژمی هەوای سەرکەوتوو دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی پەستانی هەواکە.

## ب- ناوچەکانی پەستانی هەوای سەر گۆی زەوی:

لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشتر باسمان کرد دەتوانین گۆی زەوی دابەشبکەین بە چەند ناوچەیەکی پەستانەوە کە ئەمانەن:

(بڕوانە وێنەی ژمارە (١٨).




وێنەی ژمارە (١٨)

ناوچەکانی پەستانی هەوای سەرگۆی زەوی وە ئاراستەی جوڵەی بایەکان

## ١- ناوچەیەکی پەستان نزم لە دەروبەری هێڵی یەکسانی:

ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نێوان (هێڵی یەکسانی — ٥ پلە)ی باکوورو باشووری هێڵی یەکسانیەوە، هۆی نزمی پەستان لەم ناوچەیەدا دەگەڕێتەوە: بەرزیی پلەی گەرمی، بوونی تەوژمی هەوای سەرکەوتوو، زۆری ڕێژەی هەڵمی ئاو لە هەوای ناوچەکەدا.

## ٢- دوو ناوچەی پەستان بەرز لە دەوروبەری خولگەکان:

ئەم دوو ناوچەیە دەکەونە دەوروبەری هەردوو بازنەی پانی ٣٠° باکوور و باشووری هێڵی یەکسانی، هۆی سەرەکی بەرزی پەستان لەم دوو ناوچەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ، بوونی تەوژمی هەوای داکەوتوو کە لە بنەڕەتدا لە ناوچەکانی هێڵی یەکسانیەوە سەرکەوتووە.

### ٣- دوو ناوچەی پەستانی نیمچە نزم لە بازنە پانیە دوورەکان:

ئەم دوو ناوچەیە دەکەونە دەوروبەری بازنەی پانی ٦٠° باکوورو باشووری هێڵی یەکسانی، هۆی سەرەکی نزمی پەستان لەم دوو ناوچەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تەوژمی هەوای سەرکەوتوو.

### ٤- دوو ناوچەی پەستان بەرز لە دەوروبەری جەمسەرەکان:

ئەم دوو ناوچەیە دەکەونە هەردوو جەمسەری باکوور و باشوورەوە هۆی بەرزی پەستان لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ نزمی پلەی گەرمی، کەمی ڕێژەی شێ، بوونی تەوژمی هەوای داکەوتوو.

### جـ- پێوانەکردنی پەستانی هەوا:

پەستانی هەوا بە (میلیبار) دەپێورێت، ژمارەیەکی زۆر دەزگا هەیە کە پەستانی پێدەپێورێت لەوانە بارۆمەتری کانزایی و بارۆمەتری جیوەیی و باروگراف.(بڕوانە وێنەکانی ژمارە (١٩ ، ٢٠ ، ٢١)




وێنەی ژمارە (١٩)

پەستان پێو (بارۆمەتر)ی کانزایی




وێنەی ژمارە (٢٠)

پەستان پێوی تۆمارکەر (بارۆگراف)




وێنەی ژمارە (٢١)

پەستان پێوی جیوەیی (بارۆمەتر)

## ب- باروگراف و بەشەکانی

## جـ- بارومەتری جیوەیی

١- قوتویەکی کانزایی. ٢- بەرزکەرەوەکان.

٣- قۆڵ. ٤- لوولەك.

## ٣- بــــــا:

بریتیە لە بزووتنەوەی سروشتی هەوا بە شێوەیەکی ئاسۆیی بە ئاڕاستەی جیاوازو بە خێرایی جیاواز لە شوێنی پەستان بەرزەوە بەرەو شوێنی پەستان نزم کە، خێرایی بایەکـە دەگۆڕێت لـە ناوچـەیەکەوە بـۆ ناوچـەیەکی تـرو لـە کاتێکـەوە بـۆ کـاتێکی تـر، لەبـەر دوو هۆکـار، یـەکێکیان جیـاوازی پلـەی پەستانەکە لە نێوان شوێنی پەستانە بەرزەکەو شوێنی پەستانە نزمەکە هەتا جیاوازییەکـە زۆرتـر بێـت خێراییەکـەش زۆرتـر دەبێـت، ئـەویتریان هێـزی لێکخشانی بایەکەیە لەگەڵ بەرزو نزمییەکانی ڕووی زەویدا، هـەتا لێکخـشانی بایەکی زۆرتربێت خێراییەکەی کەمتر بێت.

جا بۆیە ناوی بایەکە بە پێی خێراییەکەی دەگۆڕێت، گەر لەسەر خۆبوو پێی دەگوترێت (سروە) یان (شنە) گەر مام ناوەندی بوو پێی دەگوترێت (با) گەر زۆر خێراو تێکدەر بوو دەبێتە (گەردەلوول).

## أ- خەسڵەتەکانی با:

١- با بە ناوی ئەو شوێنەوە ناو دەنرێت کە لێوەی هەڵدەکات، بۆ نمونە گەر لە باکوورەوە بەرەو باشوور هەڵبکات بە بای باکوور ناو دەبرێت گەر لە باکووری خۆرهەڵاتەوە هەڵبکات بەرەو باشووری خۆرئاوا بە بای باکووری خۆرهەڵات ناو دەبرێت (بڕوانە وێنەی ژمارە ٢٣).

٢- با سیفەت و نیشانەکانی ئەو شوێنەی کە لێوەی هەڵکردووە دەیگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی هەڵدەکات و بەسەریدا تێدەپەڕێت، گەر با لە شوێنێکی گەرمەوە هەڵبکات، ئەوا گەرمی دەگوێزێتەوەو دەشێ ببێتە هۆی دابارین (ئەگەر لە دەریاوە هاتبێ).

٣- با بە شێوەیەکی ئاسۆیی هەڵناکات, بەڵکو لادانێك دەکەوێتە ئاڕاستەکەیەوە، بەو جۆرە ئەو بایەی کە لە نیوە گۆی باکووری زەویدا هەڵدەکات کەمێك بەلای ڕاستی خۆیدا لادەدات ئەو بایەی لە نیوە گۆی باشووری زەویدا هەڵدەکات کەمێك بەلای چەپی خۆیدا لا دەدات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا. بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٢).




شێوەی ژمارە (٢٢)

لادانی با

## ب- جۆرەکانی با:

دەتوانرێت (با) بە پێی کاتی هەڵکردنەکەی دابەش بکرێت بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوە:

### ١- بایە هەمیشەییەکان: (بایە گشتیەکان):

بەردەوام هەڵدەکاتە سەر زۆربەی ناوچەکانی گۆی زەوی وە هەڵکردنی پشت دەبەستێ بە دابەشبوونی گشتی پاڵەپەستۆی هەوا بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە دابەش دەکرێن:

#### ١- بای بازرگانی:

ئەم بایە لە هەردوو ناوچەی (پەستانی بەرز) دەوروبەری خولگەکانەوە (دەوروبەری بازنەی پانی٣٠°باکوورو باشووری هێڵی یەکسانی) هەڵدەکاتە سەر ناوچەی (پەستانی نزم) دەوروبەری هێڵی یەکسانی ئاراستەکەی لە نیوە گۆی باکوور، باکووری خۆرهەڵاتەو لە نیوە گۆی باشوور، باشووری خۆرهەڵاتتە، خێرایەکەی مام ناوەندییەو (ڕێرەوی نەگۆڕە) لە زۆربەی وەرزەکانی ساڵدا هەیە.

#### ٢- بای پێچەوانە:

لە هەردوو ناوچەی (پەستانی بەرز) دەوروبەری خولگەکانەوە هەڵدەکاتە سەر هەردوو ناوچەی (پەستانی نزم) بازنەی پانی (٦٠°) باکوورو باشوور (هێڵی یەکسانی) بۆیە ناونراوە بای پێچەوانە چونکە ئاراستەکەی پێچەوانەی بای بازرگانییە، واتە لە نیوە گۆی باکوور باشووری خۆرئاوایە وە لە نیوە گۆی باکووری خۆرئاوایە، ئەم بایە شێ و گەرمی لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ سەر ئەو ناوچانەی کە هەڵدەکاتە سەری و دەبێتە هۆی داباریین بە تایبەتی لە زستاندا.

## ٣- بای جەمسەریی:

لـە هـەردوو نـاوچـەی (پەستـانی بەرز) دەوروبـەری جـەمسـەرەکانـەوە هەڵدەکاتە سەر هەردوو ناوچەی (پەستـانی نزم) دەوروبەری بازنەی پـانی (٦٠°) بـاکوور و باشووری هێلی یەکسانی ئاراستەکەی وەک بای بازرگـانی وایە، واتە لە نیوە گۆی باکوور، باکووری خۆرهەڵاتەو لە نیوە گۆی باشوور، باشووری خۆرهەڵاتە، بایەکی زۆر ساردو وشکە.

(بڕوانە شێوەی ژمارە (٢٣)).




وێنەی ژمارە (٢٣)

بایە گشتیەکان

## ٢- بایە خۆجێیەکان:

### أ- وەرزە با:

لەئەنجامی جیاوازی پلەی گەرمی ئاووشکانیدا ئەم جۆرە بایە هەڵدەکات(بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە ڕووبەرێکی وشکانی فراوان دراوسێی ڕووبەرێکی ئاوی فراوان دەبێت) ئەم بایە لە باشوورو باشووری خۆرهەلاتی ئاسیا بە ئاشکرا دەردەکەوێت، لە وەرزی هاویندا ڕووبەرە وشکانیە فراوانەکان، بە هۆی ستوونی و نیمچە ستوونی تیشکی خۆرەوە، پلەی گەرمییان بەرز دەبێتەوە، دەبنە ناوچەیەکی گەرم، بەلام ڕووبەرە ئاوییەکانی درەنگ گەرم دەبن لە چاو ڕووبەرە وشکانیەکان بۆیە دەبنە ناوچەیەکی گەرمی مام ناوەند (ئاو درەنگ گەرم دەبێت و درەنگیش سارد دەبێتەوە، بەلام وشکانی بە پێچەوانەوەیە) بەوەش جیاوازی دروست دەبێت لە پلەی پەستانی وشکانی و ئاوەکەدا، ڕووبەرە وشکانیەکان دەبنە ناوچەیەکی پەستان نزم بە پێچەوانەوە ڕووبەرە ئاوییەکان دەبنە ناوچەیەکی پەستان بەرز بۆیە لە هاویندا وەرزە با لە ئاوەوە هەڵدەکاتە سەر وشکانی لەبەر ئەوەی بڕێکی زۆری شێ لەگەڵدایە دەبێتە هۆی باران بارین لە هەموو ئەو ناوچانەی ئەم بایە بەسەریاندا تێدەپەڕێت. بەلام لە زستاندا کە تیشکی خۆر لاردەبێت لەسەر ئەم ناوچانە گەرمی دانەوە زۆرتر دەبێت لە گەرمی وەرگرتن، لەبەرئەوەی ووشکانیەکان زیاتر سارد دەبنەوە لە چاو ڕووبەرە ئاوییەکاندا دەبنە ناوچەیەکی پەستان بەرز، ڕووبەرە ئاوییەکان دەبنە ناوچەیەکی پەستان نزم، بۆیە لە زستاندا وەرزە با لە وشکانییەوە هەڵدەکاتە سەر ڕووبەرە ئاوییەکان، بایەکی ساردو وشکە بە گشتی بارانی پێوە نییە مەگەر بەسەر ڕووبەری ئاویدا تێپەڕبێت و شێدار ببێت.

(بڕوانە نەخشەی ژمارە (٩)).




نەخشەی ژمارە (٩)
وەرزە با لە هاوین و زستاندا

**ب- شنەی دەریا و شنەی زەوی:**

جیاوازی پەستان لە شەو و ڕۆژدا لە نێوان ئاو و وشکانیدا دەبێتە هۆی هەڵکردنی بای ناوچەی ڕۆژانە، کاریش دەکاتە سەر کەشی ئەو ناوچانەی لە دەریاوە نزیکن، ئەمە لە دیاردەی وەرزەبا لە ڕووی هۆکاری دروست بونی دەچێت، بەڵام جیاوازی لەگەڵ ئەودا ئەوەیە، کە ئەم ڕۆژانە دووبارە دەبێتەوەو، تەنها ناوچە کەنار دەریاکانیش دەگرێتەوە. جیاوازی نێوان پەستانی وشکانی و ئاوەکە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لەسروشتی ئەو دووانەدا ـ وەک پێشتر باسی لێوەکرا ـ لە ئەنجامی ئەمەدا بە ڕۆژ هەوا گەرمەکەی سەر وشکانیەکە وە دەکشێ و بەرز دەبێتەوە بۆ سەرەوە بەوەش زۆرتر پەستانەکەی نزم دەبێتەوە، بۆیە با لە شوێنی پەستان بەرزەکەوە کە ڕووبەرە ئاوییەکە هەڵدەکاتە سەر وشکانییەکان، واتە شنەی دەریا بە ڕۆژ لە ئاوەوە هەڵدەکاتە سەر وشکانی. دەبێتە هۆی فێنککردنەوەی وشکانییەکانی نزیک دەریا.

بەڵام لە شەودا ئـەم کـرداره پێـچەوانە دەبێتـەوە، وشـكانییەكان خێراتـر سارد دەبنەوەو دەبنە ناوچەیەكی پەستان بەرزو ڕووبـەرە ئاوییـەكان دەبنـە ناوچەیەكی پەسـتان نـزم، بۆیـە شـنەی زەوی لـە ڕووبـەرە وشـكانییەكانەوە هەڵدەكەنە سەر ڕووبەرە ئاوییەكان، دانیشتوان شارەكانی سەر دەریـا وەكـو (بەیروت، ئەسكەندەرییە) هەست بەم دیاردەیە دەكەن.

(بڕوانە شێوەی ژمارە (٢٤).




شێوەی ژمارە (٢٤)

شنەی زەمین و شنەی دەریا

## ج- شنەی چیاو دۆڵ:

ئەمەش هەر بابیەکی ناوچەییە وەکو شنەی دەریاو شنەی زەمین وایە، بەڵان لە نێوان بەرزاییەکان و نزمابیەکاندایە. واتە لە نێوان چیاو دۆڵەکاندا.

لە شەودا ئەو هەوایەی بەسەر ناوچە بەرزاییەکانەوە خێراتر سارد دەبێتەوە لە چاو ئەو هەوایەی لە دۆڵەکاندایە، واتە پەستانەکەی بەرزترە لە چاو ئەوەی ناو دۆڵەکان، بۆ هەواکە بەرەو دۆڵەکان دێت بەوە دەگوترێت شنەی چیا، کەواتە شنەی چیا بە شەو لە ناوچە بەرزاییەکانەوە دێت بەرەو دۆڵەکان، بەڵام لە ڕۆژدا کە پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە لەسەر چیاکان, ئەو کات هەوا لە دۆڵەکانەوە بەرەو ناوچە بەرزاییەکان دەڕوات بەوەش دەگوترێت شنەی دۆڵ، کەواتە شنەی دۆڵ بە ڕۆژ لە دۆڵەکانەوە دەڕوات بۆ ناوچە بەرزاییەکان.

## پێوانەکردنی با:

١- **پێوانەکردنی ئاڕاستەی با:** بەهۆی دەزگایەکەوە دەپێورێت کە پێی دەگوترێت (باگێڕ). سەرنجی وێنەی ژمارە ( ٢٥ ) بدە.

٢- پێوانە کردنی خێرایی با: بە هۆی دەزگایەکەوە دەپێورێت کە پێی دەگوترێت (خێرایی پێو) (ئەنیمومەتر) سەرنجی وێنەی ژمارە (٢٦)بدە.




وێنەی ژمارە (٢٥)



وێنەی ژمارە (٢٦)

خێرایی پێوی با (ئەنیمومەتر)

## ٤- شێ و دابارین:

مەبەست لە شێی ناو بەرگە گازەکە، ئەو بڕە ئاوەیە کە لە ناو بەرگە گازەکەدا هەیە جا بەهەر شێوەیەك بێت، هەڵمی ئاو، شل، ڕەق. مەبەستیش لە دابارین هاتنە خوارەوەی ئەو بڕە هەڵمە ئاوەیە کە خەستبۆتەوە جا بە شێوەی باران بێت یان تەزرە یان بەفر.

بەڵام باران ئەو دڵۆپە ئاوەیە کە کێشەکەی هێندە قورس بووە چیتر هەواکە ناتوانێت هەڵیبگرێت و دەکەوێتە سەر زەوی:

### أ- مەرجەکانی خەست بوونەوەو دابارین:

کە هەڵمی ئاو خەست دەبێتەوە واتە لە دۆخی گازییەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخی شلی یان ڕەقی، ئەم شێوەیانەی لای خوارەوە وەردەگرێت، هەور، تەم، زوقم، شەونم.

بۆ ئەوەی کرداری خەست بوونەوە ڕووبدات دەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوە بێتەدی:

١- بوونی بڕێکی باش لە هەڵمی ئاو لە هەوادا.

٢- نزم بوونەوەی پلەی گەرمی هەواکە تا ڕادەی چڕبوونەوە.

٣- بوونی بڕێك ناووکی ڕەق تا هەڵمە ئاوەکەی لە دەوری خەست بێتەوە.

کە ئەم مەرجانە دەستەبەر بوو ئەوا خەست بوونەوە ڕوو دەدات و هەور دروست دەبێت بەڵام دڵۆپێك لە ئاوەکەی ناو هەورەکە، یان کوڵووە بەفرەکەی ناوی هێشتا ئەوەندە سووکە هەواکە دەتوانێت هەڵیبگرێت کەواتە لە دوای کرداری خەست بوونەوە، دەبێت کرداری تریش ڕووبدات هەتا ئەو دڵۆپە ئاوە یان ئەو دەنکۆڵە ڕەقانە بکەونە سەر زەوی، کردارەکەش

گەورەبوونە جا بەهەر ڕێگایەك بێت كە گەورەبوو ئیتر هەواكە ناتوانێت هەڵیبگرێت و دەكەوێتە سەر زەوی.

### ب- جۆرەكانی باران:

بە گوێرەی ئەو ڕێگایەی پلەی گەرمی هەوا شێدارەكەی پێ نزم دەبێتەوە، باران دابەش دەبێت بۆ ئەم جۆرانە:

### ١- بارانی بەرزەڕۆ: (التصاعدیە):

ئەو بارانەیە كە ناوچە گەرمەكاندا دەبارێت، بە تایبەتی ناوچە كەمەریەكان، هۆی بارینی ئەم جۆرە بارانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەوژمە هەواییانەی بەرز دەبنەوە بۆ سەرەوە، بە بەرزبوونەوەی هەوا شێدارەكە پلەی گەرمییەكەی دادەبەزێت هەتا پلەی خەست بوونەوە، دوواتر هەوری لێدروست دەبێت و بارانی بە خوڕو لێزمەی لێدەبارێت (بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٧).




وێنەی ژمارە (٢٧)

بارانی بەرزە ڕۆ

## ٢- بارانی بەرزە هەرێم: (التضاريسية):

ئەو بایەی لە دەریاو زەریاکانەوە دێت بڕێکی زۆر هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت، کاتێك دەگاتە بەرزایی ناوچە شاخاوییەکان ناچار دەبێت بەرز دەبێتەوە، بەوە پلەی گەرمییەکەی دادەبەزێت و دوواتر هەڵمە ئاوەکە خەست دەبێتەوە، پاشان دەبێتە دابارین بەسەر لوتکە و قەد پاڵەکاندا دەبارێت، لە دیوی ڕووبەڕووی بایەکەدا بارین زۆرتر دەبێت لە چاو ئەو دیوەی کە پێی دەگوترێت دیوی سێبەری باران، چونکە لە دیوی سێبەری بارانەکەدا هەوا شێدارەکە دێتە خوارەوەو دادەبەزێت بەوەش پلەی گەرمیەکەی بەرزدەبێتەوەو کەمتر کرداری خەست بوونەوە ڕوو دەدات، ئەم جۆرە بارانە لە ناوچە شاخاویەکاندا زۆرە وەك وڵاتی خۆمان.

(بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٨) ).




وێنەی (٢٨)

بارانی بەرزە هەرێم

## ٣- گەردەلوولە باران: (الأعصارية):

ئەو بارانەیە کە لە گەردەلوولەوە پەیدا دەبێت، بە تایبەتی ئەوانەی کە بای خۆرئاوا دەیانهێنێت (وەك بەشێکی بارانی هەرێمی کوردستان)، ئەم جۆرە لە بەیەکگەیشتنی ئەو بارستە هەوایانەوە پەیدا دەبێت کە لە خەسڵەتدا جیاوازن لە یەکتری بارستەیەکیان گەرم و شێدارە و ئەوی تریان ساردو وشکە، لە ئەنجامدا گەرم و شێدارەکە بەرز دەبێتەوە بۆ سەرەوە چونکە سووکترە، بەو بەرزبوونەوەی پلەی گەرمییەکەی نزم دەبێتەوە دوواتر خەست بوونەوە داباربن بە لێژنە ڕوودەدات.

(بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٩).




وێنەی ژمارە (٢٩)

گەردەلوولە باران

## جـ- پێوانەکردنی دابارین:

داباربن بە هەر شێوەیەك بێت (باران، بەفر، تەرزە) هەر بە شێوازی شلی مامەڵـەی لەگـەڵ دەکرێـت و دەگوترێـت ئەوەنـدە ملليمـەتريان ئەوەنـدە سانتیمەتر باریوە، ئەوەش بە گەلێ ڕێگاو دەزگای جیاواز پێوانە دەکرێ کـە ساکارترینیان باران پێوە. بڕوانە وێنەی ژمارە (٣٠).




وێنەی ژمارە (٣٠)

(باران پێو) نیشان دەدات

## زارەوەكـــــان

| | |
|---|---|
| ١- بەرگە ڕەقەكە (بەرگی بەردین): | **Lithosphere** |
| ٢- بەرگە ئاوەكە: | **drosphere** |
| ٣- بەرگە گازەكە: | **Atmosphere** |
| ٤- بەرگە زیندەگیەكە: | **Biosphere** |
| ٥- دۆڵ: | **Valley** |
| ٦- بان: | **Paltean** |
| ٧- گرد: | **Hill** |
| ٨- چیا | **Mountain** |
| ٩- دەشت: | **Plain** |
| ١٠- بەرزو نزمی ڕووی زەوی: | Relief |
| ١١- كەش: | **Weather** |
| ١٢- ئاووهەوا | **Climate** |
| ١٣- پلەی گەرمی | **Temperature** |
| ١٤- پەستانی هەوا: | **Pressure** |
| ١٥- شێ: | **Humidity** |
| ١٦- دابارین: | **Precipitation** |
| ١٧- هەڵمی ئاو | **Water Vapour** |
| ١٨- هەور: | **Cloud** |
| ١٩- تەم: | **Fog** |
| ٢٠- شەونم: | **Dew** |
| ٢١- زوقم: | **Frost** |
| ٢٢- بارستە هەوا: | **Airmass** |
| ٢٣- گەردەلوول | **Cyclone** |
| ٢٤- باران: | **Rain** |
| ٢٥- تەرزە: | **Hail** |
| ٢٦- بـــــــا: | **Wind** |

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

پ١/ ڕاست و هەڵەی ئەمانەی خوارەوە دیاری بکەو هەڵەکانیش ڕاست بکەرەوە:

١- بە تەنها بەرگە ئاوەکە، بەرگی زیندەگی پێك دێت.

٢- دەریا دەرەکییەکان کەوتوونەتە ناو کیشوەرەکان بە گەرووی تەنگ بە زەریاکان دەگەن.

٣- هەتا پلەی گەرمی بەرز بێتەوە پەستانی هەواش بەرزدەبێتەوە.

٤- با بە ناوی ئەو شوێنەوە ناو دەنرێت کە لێوەی هەڵدەکات.

٥- زۆرینەی بارانی کوردستان لە جۆری بارانی بەرزە ڕۆیە.

٦- دیوی سێبەری باران زۆرتری لێدەبارێ نەك دیوی ڕووبەڕووی بایەکە.

٧- هەتا هەوا پاکژو خاوێن بێت تیشکی خۆرمان زۆرتر دەگاتێ.

پ٢/ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وەڵامی گونجاو پڕ بکەرەوە:

١- زەوی لە ٣ بەرگ پێکهاتووە کە ئەمانەن : أ- ............

ب- ............ جـ- ............. .

لە تێکەڵاوبوونی ئەم سێ بەرگەشدا بەرگێکی تر دروست دەبێت ئەویش ............ یە .

٢- گەورەترین زەریا ............ وە بچووکترینیش ............

٣- وەرزە با لە زستاندا لە ............... هەڵدەکات بۆ ...............

٤- مەرجەکانی خەست بوونەوەی هەڵمی ئاو بریتین لە أ- ............ ب- .............

جـ- ............... .

٥- له جیاوازییه گەورەکانی نێوان وەرزەبا و شنەی دەریـا و شـنـەی زەمـین

أ- ...............

ب- ...............

پ٣/ وەڵامی ڕاست بۆ ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە هەڵبژێرە:

١- بانی (دکن، تبت، نەجد) فراوانترین بانە لە جیهاندا.

٢- دەریـای (چـین، قـەزوین، ناوەڕاسـت) لـە هـەموو لایەکـەوە بـە وشـکانی دەورە دراوە بە دەریاکان ناگات.

٣- خێرایی با بە ئامێرێك دەپێورێت پێی دەگوترێت (ئەنیمۆمەتر، باگیر).

٤- (پلەی گەرمی، پەستانی هەوا، دابارین) بە گرنگترین ڕەگـەزی ئـاوو هـەوا دادەنرێ.

٥- هەر ناوچەیەك تەوژمی هەوای داکەوتووی هـەبێت پەسـتانەکەی (بـەرزە، نزمە، مام ناوەندییە).

پ٤/ هۆی ئەم دیاردانەی خوارەوە ڕوون بکەرەوە:

١- تیشکی ستوون ناوچەکە زۆرتر گەرم دەکات وەك لە تیشکی لار.

٢- نزمی پەستانی هەوا لە ناوچەکانی دەوروبەری هێڵی یەکسانی.

٣- هـەرچەند لـە ئاسـتی ڕووی دەریـاوە بەرزبینـەوە بۆسـەرەوە پلـەی گـەرمی دادەبەزێت.

٤- هـەرچەندە هەڵمی ئاو لـە هـەوادا زۆرتر بێت، پەستـان کەمتر دەبێت.

پ٥/ جیاوازی چییە لە نێوان:

١- کەش و ئاوو هەوا.

٢- دەریا و زەریا.

٣- بایە گشتییەکان و بایە خۆجییەکان.

پ٦/ ناوچەکانی پەستانی هەوای سەر گۆی زەوی باس بکە پاشان وێنەیەکی ڕوونکردنەوەی بۆ بکێشە:

**چالاکی:**

گەر لە تواناتاندا هەیە سەردانی نزیکترین وێستگەی کەشناسی بکەن لە ناوچەکەتاندا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە شارەزای دەزگاکانی پێوانە کردن ببن.

# بەشی چوارەم
# دانیشتوان

## دانیشتوان:

لێکۆڵینەوەی دانیشتوان بایەخێکی گرنگی هەیە چونکە سەرچاوەی گشت ڕواڵەتە کۆمەڵایەتی، دیمۆگرافی[1]، ئابووری، ڕامیارییەکانن، لەبەرئەوە لە دێرزەمانەوە زانایان و شارەزایان و ڕێکخراوە نێو دەوڵەتی و دەوڵەتانیش توێژینەوەو بڵاوکراوەی بەردەوامیان ئەنجام داوە.

دانیشتوان دوای جەنگی جیهانی دووەم بە شێوەیەکی ئاشکرا ژمارەیان ڕووەو زیادبوون ڕۆیشتووە، ئەم ڕاستییەش لەسەر ژمێرەکانی دانیشتوان و ئاماردا کە لە وڵاتانی جیهاندا کراوە بەدەردەکەوێ.

گرنگی سەرژمێرییەکان و ئاماریش لەوەدایە، بارودۆخی دانیشتوان لە پێکهاتە و گەشەکردن و گۆڕانکارییە دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دیاری دەکەن، لەبەر ئەوە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان هەوڵیان داوە پلانی زانستی و ڕامیاری گونجاو دابنێن بۆ دانیشتوان بۆ ئەوەی هاوسەنگی بکەن و ڕادە دابنێن بۆ زۆربوونی دانیشتوان لەگەڵ ئەو دەرامەتە سروشتی و مرۆییانەش کە بە دەست دەهێنرێت زیاتر بکرێ و شێوازی بەرهەم هێنان لە ڕووی جۆرو قەبارەوە بگۆڕێ بۆ ئەوەی گوزەران و بژێوی دانیشتوان باشترو گونجاو تربێ هەوڵی چارەسەرکردنی گیرگرفتەکانی

---

(١) دیمۆگرافیا: زانستی لێکۆڵینەوەی دانیشتوانە لە ڕووی چەندایەتیەوە، ئەمەش بەهۆی ئامارە زیندەگیەکانی وەك (لەدایك بوون و مردن، کۆچ کردن) هۆیەکانی کەم و زۆرکردنی دانیشتوان ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانە دەردەخات.

دانیشتوان لە ڕووی ڕامیاری دەوڵەتان و ئابووری و کۆمەڵایەتی و نیشتەجێی و کەم دەرامەتی و هەژاری لەجیهاندا بە پلانی زانستی هەنگاوی بۆ بنرێت.

سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەی دانیشتوان:

**أ- سەرژمێری کردنی دانیشتوان (التعداد العام للسكان):**

**سەرژمێری کردنی گشتی:** بریتییە لە پرۆسەی کۆکردنەوەو ئامادەکردن و شیکردنەوەو هەڵسەنگاندن بڵاوکردنەوەی زانیارییە دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەربارەی خەڵکانی وڵاتێك یان ناوچەیەکی دیاریکراوە لە کاتێکی دیاریکراودا.

## تایبەتمەندییەکانی سەرژمێری کردنی دانیشتوان:

١- تۆمارکردنی زانیاری ئامارەکانی ناونووس کردن بۆ هەموو کەس بێت، بەبێ جیاوازی تەنانەت بیانییەکانیش لە ناوخۆی وڵاتێك بگرێتەوە.

٢- سەرژمێرەکە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو دەگرێتەوە.

٣- کاتی دیاریکراو بۆسەرژمێریکردن دادەنرێت بە شێوەی خولی کە (٥-١٠) ساڵ جارێك دەبێت.

## گرنگی سەرژمێرییەکانی دانیشتوان:

١- زانینی زانیاری دەربارەی ژمارەی دانیشتوان و دابەش بوونیان لە ناوچەی دیاریکراودا.

٢- زانینی زانیاری سەبارەت بە پەرەسەندن و گۆڕانکارییە بەردەوامەکانی دانیشتوان وەك (لە دایکبوون، مردن، کۆچکردن، ژنومێردایەتی، جیابوونەوە...........هتد).

ب- ئاماری دانیشتوان (الأحصاء السكاني):

بریتییە لە توێژینەوەی زانستیانە سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوان لە ڕووی تایبەتمەندی و چالاکی گۆڕانکاری کۆمەڵگە وەك لەدایك بوون، مردن، کۆچکردن، ژنهێنان، جیابوونەوە.......هتد.

**((جیاوازی لە نێوان سەرژمێری کردن و ئاماری دانیشتوان)):**

١- سەرژمێری دانیشتوان تایبەتمەندییەکانی تاکەکەس دەگرێتەوە بە گشتی لە وڵاتدا، بەڵام ئامارەکانی دانیشتوان گۆڕانکارییە دیمۆگرافییەکان دەردەخات.

٢- سەرژمێرییەکان بە شێوەی خوولیە، بەڵام ئاماری دانیشتوان ساڵانەیە.

## گەشە سەندن و زۆربوونی دانیشتوان:

**گەشەسەندن:** بریتییە لە زۆربوونی دانیشتوان کە لە نێوان دوو سەرژمێری زانراودا دەردەکەوێت و ئەمەش لە ئەنجامی جیاوازی نێوان ژمارەی لە دایکبوون و ژمارەی مردوان و کۆچ کەرانەوە پەیدا دەبێت... گەشە سەندنیش دوو جۆرە.

### أ- زۆربوونی سروشتی:

بریتییە لە جیاوازی نێوان ژمارەی لە دایکبوون و لەگەڵ ژمارەی مردوان لە ماوەیەکی دیاری کراو و لە ناوچەیەکی دیاریکراودا.

واتە کاتێك ڕوودەدات کە ژمارەی لە دایك بوون زیاتر بێت لە ژمارەی مردن لە ناوچەیەکدا یان لە وڵاتێکدا.

زۆربوونی سروشتی بریتییە لە (ژمارەی لە دایکبوون - ژمارەی مردن) زۆربوونی سروشتی ساڵانە لە وڵاتانی جیهاندا ڕوو لە زۆربوونە بە تایبەتی لە

ولاّته گەشندەكان لە كیشوەرەكانی ئاسیا، ئەفریقا، ئەمەریكای لاتـین)، وەك ولاّتانی (هندستان و بەنگلادیش) بەلاّم لە ولاّتانی پێشكەوتووی پیـشەسازی وەك خۆرئاوای ئەوروپا و ولاّتە یەكگرتووەكان زۆرینە بـەهۆی دیـاری كردنـی وەچە واتە رادە دانان بۆ زۆربوون.

## ب- زۆربوونی ناسروشتی:

ئەم جۆرە زۆربوونە لە ئەنجامی جیاوازی لە نێوان لـە دایكبـوون و مـردن پەیدا نابێت، بەڵكو بەهۆی كـۆچ كـردن بـۆ دەرەوەی ولاّت

## دابەش بوونی دانیشتوان:

دانیشتوانی جیهان بەسەر ڕووبەری زەویدا بـە جـۆرێكی یەكسان دابـەش نـین ، چونكە وا دادەنرێت كـە نزیكـەی (٥٠٪) دانیـشتوانی جیهـان لەسـەر ڕووبەرێك دەژین كە لە (٥٪) كـۆی ڕووبـەری وشـكانی تـێ ناپـەڕێ، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت وشـكانی گـۆی زەوی لـە چـەند بەشـێكدا ئاوەدانـەو لـە بەشەكانی تریدا چۆڵە یان نیمچە چۆڵە.

شێوازی دابەشبوونیان جیاوازە لە ناوچـەیەكەوە بـۆ ناوچـەیەكی تـر، ناوچـە چـوڵەوانەكان یـا كـەم دانیـشتوانەكان ئـەو ناوچـانەن كـە بـە هـۆی زۆرنـزم بوونەوەی پلەی گەرمییە تیایاندا وەك ناوچەكانی هەردوو جەمسەری بـاكوور

و باشوور، یان بە هۆی بەرزی پلەی گەرمی و وشکی ئاووهەوای وەك بیابانە گەرمەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاو باکوری ئەفەریقاو هەرێمەکانی دارستانی هێڵی یەکسانی لە ئاوزێڵی ئەمەزۆن و کۆنگۆ. کیشوەرەکانی جیهانی کۆن (ئاسیا، ئەوروپا، ئەفریقیا) زۆرترین ژمارەی دانیشتوانیان تیا نیشتەجێ بووە کە دەکاتە (٨٥٪) دانیشتوانی جیهان و(١٥٪) ئەو دانیشتوانەی کە ماوە دەکەونە کیشوەرەکانی جیهانی نوێ (ئەمەریکای باکوور، ئەمەریکای باشوور، ئوسترالیا) واتە زۆربەی دانیشتوان دەکەونە نیوە گۆی باکووری زەوی، چونکە زۆربەی وشکانی لە نیوەی باکووردایە و نیوەی باشووری زەوی وشکانی کەمترە.



## چڕی دانیشتوان:

بریتیە لە دابەشکردنی ژمارەی دانیشتوان لە ناوچەیەکدا بەسەر ڕووبەری ئەو زەویەدا کەلەسەری دەژین.

چڕی دانیشتوان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی ترو لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر جیاوازە، بەهۆی جیاوازی بارودۆخی سروشتی و جوگرافی و چالاکییە مرۆڤیەکانی وەك (ئابووری، شارستانی، کۆمەڵایەتی، ڕامیاری).

بڕوانە خشتەی ژمارە (٤) چڕی دانیشتوان بە گوێرەی کیشوەرەکانی جیهان دەردەخات.

| کیشوەر | چڕی کەس/کم$^{2}$ | کیشوەر یان ناوچە | چڕەی کەس/کم$^{2}$ |
| --- | --- | --- | --- |
| ئەفریقیا | ١٦ | ئوستراليا | ٣ |
| ئەمەریکای باکوور | ١٢ | جیهان بە گشتی | ٣٥ |
| ئەمەریکای باشوور | ١٩ | | |
| ئاسیا | ٩٧ | عێراق | ٣٨ |
| ئەوروپا | ٩٩ | هەرێمی کوردستانی عێراق | ٢٦ |

خشتەی ژمارە (٤)

چڕی دانیشتوان لە جیهاندا

## جۆرەکانی چڕی:

چڕی دانیشتوان بۆ ئەم بەشانە دابەش دەکرێ:

١- چڕی گشتی: بریتیە لە دابەشکردنی ژمارەی دانیشتوانی وڵاتێك یان ناوچەیەك بە گشتی بەسەر ڕووبەری گشتی وڵات یان ناوچەکەدا.

٢- چڕی کشتوکاڵی: بریتیە لە دابەش کردنی ژمارەی دانیشتوانی ناوچەیەك یا ووڵاتێك بەسەر ڕووبەری کشتوکالی.

٣- چڕی ئابووری، ئەم جۆرانەی تری چڕی گونجاوترن بۆ زانینی باری ئابووری و پیشەکانی تری مرۆڤ و بە شێوەیەکی ڕوونتر زۆر و کەمی چڕی دیاری دەکات.

دانیشتوانی جیهان بە پێی چڕی بەسەر سێ ناوچەدا دابەش دەکرێ کە ئەمانەن:

## ١- ناوچە زۆر چڕەکان:

چڕی دانیشتوان لەم ناوچەیەدا زیاترە لە (١٠٠کەس/کم$^{2}$) وەکو باشووری خۆرهەلاتی ئاسیا، ناوەڕاست و خۆرئاوای ئەوروپا ئەمەش بەهۆی زۆری چالاکی کشتوکاڵ و پیشەسازی و چالاکی تر .

## ٢- ناوچە ناوەندە چڕەکان:

ئەو ناوچانەی جیهان دەگرێتەوە کە چڕیان لە (١-١٠٠کەس/کم$^{2}$) وەك (ئوستراليا، کوردستان ).

### ٣- ناوچە کەم چڕەکان:

ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە چڕی دانیشتوان تیایدا زۆر دەگمەنە وە کەمتر لەیەك کەس لەسەر کیلومەترێکی چوار گۆشە، لەبەر سەختی بارودۆخی نیشتەجێ بوون لەو ناوچانەدا لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- ناوچەی بیابانی وشك و بێ ئاو و گەرم وەك بیابانی نیمچە دورگەی عەرەب و بیابانی گەورەی ئەفریقا.

ب- ناوچە زۆر ساردەکانی هەردوو جەمسەری باکوورو باشووری زەوی.

جـ- ناوچەی بەرزایی چیاکان وەك هیمالایا لە ئاسیاو ئەندێز لە ئەمەریکای باشوور.

د- ناوچە زۆر گەرم و شێدارەکان وەك لە دارستانەکانی ئاوزێڵی ئەمەزۆن و کۆنگۆ.

### ئەو هۆیانەی کار لە دابەش بوونی دانیشتوان دەکەن:

لەوەو پێش باسمان کرد کە لە دابەش بوونی دانیشتوان لە جیهاندا جیاوازی هەیە ئەم جیاوازی‌یەش لە ئەنجامی کارتێکردنی هۆیە سروشتی ومرۆڤییەکانەوە پەیدا بووە، دەتوانین ئەو هۆکارانەش بەم شێوەی لای خوارەوە دەستنیشان بکەین:

### یەکەم: هۆکارە سروشتییەکان:

**١- ئاوو هەوا:**

ڕەگەزەکانی ئاوو هەوا بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر دابەشبوونی دانیشتوان لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان. بەرزی پلەکانی گەرمی کار دەکاتە سەر زۆر کەمی دانیشتوان، بۆ نموونە لە بیابانی گەورەی

ئەفریقا پلەی گەرمی لە وەرزی هاوین دەگاتە نزیکەی ٥٠° سەدی یان بە پێچەوانەوە نزمی پلەکانی گەرمی کار لە کەمبوونەوەی دانیشتوان دەکات وەك ناوچەی سیبریا لە ئاسیا و باکوری کەنەدا لە زستاندا پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە تا چەند پلەیەك لە ژێر سفری سەدی.

هەروەها باران بارین لە ڕووی زۆر و کەمی کار لە دابەشبوونی دانیشتوان دەکات، وەك زۆری باران بارین لە ناوچەکانی هێڵی یەکسانی لە ئاو زێڵی ئەمەزۆن و کۆنگۆ پلەی گەرمی و ڕادەی شێ و باران زۆرە چالاکی مرۆڤ کەم دەکاتەوە، ناوچە کەم بارانەکانیش وەك بیابانە گەرم و وشکەکان لە ئەفریقیا و ناوەڕاستی ئوسترالیا دانیشتوانیان کەمە.

**٢- بەرزو نزمی ڕووی زەوی:**

جیاوازی بەرزو نزمی ڕووی زەوی بووەتە هۆی جیاوازی دابەشبوونی دانیشتوان، بۆ نموونە لە دەشتەکاندا لەبەر ئاسانی هاتووچۆو چالاکیەکانی مرۆڤ بوونەتە مەڵبەندی کۆبوونەوەی دانیشتوان وەك دەشتی لیتەیی عێراق و دەشتی هەولێر و شارەزوورو بیتوێن.

بەرزایی چیاکان هۆیەکی ترن لە کەمکردنەوەی دانیشتوان لەبەر سەختی زەوییەکانیان وەك چیاکانی هیمالایا لە ئاسیا و چیای ئەندێز لە ئەمەریکای باشوور و چیاکانی حەسارۆست لە هەرێمی کوردستانی عێراق. کە هاتوچۆ لەو ناوچانەدا ئاسان نیە.

٣- جۆری خاك:

جۆری خـاك كاردەكاتـە سـەر دابەشـبوونی دانیـشتوان لـە ڕووی گرنگـی ئابووری و بەرهەمە كشتوكاڵییەكان وە بـەم پێیـە دانیـشتوان لـەو ناوچـانەی خاكەكانیان بە پیتە چڕی دانیشتوان زۆرە، وەك خاكی دەشتی سەندو كـەنج و دەشتی شارەزوور و پشدەر یان خاكی ناوچە گڕكانییەكان لـە دوورگـەكانی جاوەو ژاپۆن بەڵام خاكی بێ پیت دانیشتوانیان كەمە.

٤- سەرچاوەكانی ئاو:

كۆبوونەوەی دانیشتوان و زۆریان بەندە بە بـوونی سەرچـاوە ئاوییـەكانی وەك، ڕووبـار، دەریاچـە، بیرۆكانیـاو یـان ئـاوی ژێـر زەوی، چـونكە ئـەم سەرچاوانە سودیان بۆ كاری كشتوكاڵی و ئاژەڵداری و پیشەسازی و چـالاكی تر لێ وەردەگرن واتە ئـەو ناوچـانەی سەرچـاوەی ئاویـان زۆرە دانیـشتوانیان زۆرە و بە پێچەوانەوە، ناوچەی بیابانەكان دانیشتوانیان كەمە.

٥- سامانی كانزا:

سـامانە كانزاییـەكان ڕۆڵیـان هەیـە لەسـەر دابەشـبوون و كۆكردنـەوەی دانیشتوان ئەمـەش بـۆ دەرهێنـان و كـانزاكردن و ئیـشكردن لـە كارگەكانـدا، كانزاكانیش وەك ئاسن و مس، یان نا كـانزایی وەك فۆسـفات و گـۆگرد و یـان سەرچاوەكانی وزە وەك نەوت كـە دەبنـە هـۆی كۆكردنـەوەی دانیـشتوان لـە وڵاتانی عەرەبدا لە زۆر شوێنی بیابانەكانیدا دەردەهێنرێت و دەپاڵێورێت یان خـەڵووزی بـەردین لـە چـیاكانی ئـۆراڵ یـان ئـەوروپا یـان ئاسـن لـە ناوچـە ساردەكانی سوید و نەرویج یان مس لـە شـیلی و پـیرۆ لـە چیاكانی ئەنـدیز، بوونی ئەم سامانە دەبنە هۆی كۆكردنەوەی دانیشتوان لە شـوێنی ئیـشكردن و بەرهەم هێناندا.

## دووەم: هۆکارە مرۆییەکان:

### ١- تێکڕای لە دایك بوون و مردن:

تێکڕای گەشەسەندنی دانیشتوان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە، ئەمەش لە تێکڕاییەکانی لە دایك بوون و مردندا بە دەردەکەوێت بە جیاوازی کاردەکەنە سەر زۆرو کەمی دانیشتوان لە ئاستی وڵاتان یان ناوچەکانی جیهان، تا ڕادەیەك باری ڕۆشنبیری و شارستانی سنوور بۆ زۆربوونی دانیشتوان دادەنێت، هەروەها زوو یان درەنگ پێکەوەنانی خێزان و هۆکارە ئاینییەکانیش کاریگەریان لەسەر تێکڕای زیادبوون هەیە.

بۆ نموونە بەرزی ڕێژەی لە دایك بوون لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا کاریان لە زۆربوونی دانیشتوان کردووە، بەڵام بەرزی ڕێژەی مردن لە ناوچەکانی هندستان و و ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتین تا ڕادەیەك بەرزترە لە چاو ناوچەکانی تری جیهاندا.

### ٢- کۆچ کردن:

بریتیە لە جووڵانی دانیشتوان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بە مەبەستی گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوونەکەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، کۆچ کردنیش دوو جۆرە:

### أ- کۆچ کردنی دەرەکی:

ئەم جۆرە کۆچ کردنە جووڵانی دانیشتوان تیایدا سنووری وڵات دەبڕێت و دەچێتە وڵاتێکی ترەوەو کۆچی دەرەکی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر یان لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر جیاوازە بە(هۆی باری ڕامیاری و ئابووری و جیاوازی گەلانەوە ئەم کۆچ کردنە دەگۆڕێ)، ژمارەی زۆرو کەمیان وەك

عێراقییەکان بۆ دەرەوە یان ئەفریقیەکان بۆ ئـەوروپا و ئەمـەریکای بـاکوورو کۆچی کورد بۆ کیشوەرەکانی ئەوروپا و ئەمەریکای باکوورو ئوسترالیا.

**ب- کۆچ کردنی ناوخۆ:**

جـوولانی دانیـشتوانی نـاوخۆی ولاتـان لـە شـارێکەوە بـۆ شـارێکی تـر ڕوودەدات یان لە لادێوە بۆ شار.

ئەم کۆچ کردنە بە هـۆی چـالاکی ئـابووری، کۆمەلایەتییـەوە ڕوودەدات، وەك کۆچی دانیشتوانی ولاتە گەشەندەکان لە گوندەکانیانـەوە بـۆ شـارەکان، بـە تایبـەت لـە بـواری گەشـەکردنی پیـشەسازی لـە شـارەکاندا وەکـو کۆچـی گوندەکانی باشووری عێراق بۆ شاری بەغدادی پایتەخت.

**٣- پیشە باوەکان:**

پەیوەندی لە نێوان چڕی دانیـشتوان و پیـشە باوەکانـدا هەیـە، بـە پێـی پیشەکان لە ڕاوکردنەوە بۆ پیشەی لەوەڕاندن و کشتوکاڵ و پیشەسازی، لـە پیشەی پیشەسازیدا دەگاتە ئەوپەڕی بەهۆی جۆری پیـشەکەو ژمـارەی ئـەو کەسانەی کاری تێدا دەکەن بـۆ نموونـە پیـشەی ڕاوەشـکار تـەنها دەتوانێـت ژمارەیەکی دیاری کـراو لـە دانیـشتوان بـژێنێت واتـە چـڕی زۆر کەمـە، بـەلام پیشەسازی دەتوانێت ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان بگرێتەخۆ. هەنـدێك جـار دەگاتـە (٤٠٠) کـەس لـە هـەر کیلۆمـەترێکی چـوار گۆشـە وەك لـە ژاپـۆن و بەریتانیادا دەردەکەوێت.

# پرسیارەکانی بەشی یەکەم و دووەم

پ١/ پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

(میژوو، چاخەکانی پێش مێژوو، چاخە بەردینەکان ،چاخە مێژووییەکان).

پ٢/ نیشانەی (✓) بۆ رستە راستەکان، و نیشانەی (×) بۆ هەڵەکان دابنێ و هەڵەکان راست بکەرەوە:

١- ئەشکەوتی هەزارمێرد دەکەوێتە پارێزگای هەولێر و ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە پارێزگای سلێمانی.

٢- چاخی بەردینی ناوەڕاست لە کوردستاندا لە شوێنەواری زاوی چەمی لەنزیك شانەدەر لە پارێـــزگای هەولێر دەست نیشان کراوە.

٣- بوو کەڵەی قوڕین لەگوندی چەرمۆ دۆزراوەتەوە ، هێمایە بۆ پەرستنی خواوەندی دایك.

٤- لە دۆڵی رافیدەین نووسینی هیرۆگلیفی بەکارهاتووە و لەدۆڵی نیل نووسینی بزماری(مێخی).

٥- لەهەزارەی پێنجەمی پێش زاییندا مرۆڤ کانزای دۆزییەوە بۆیە بەم قۆناغە دەوترێت قۆناغی چاخی بەردینی کانزایی.

پ٣/ باسی دیاردە گرنگەکانی چاخی بەردینی نوێ بکە؟.

پ٤/ لەچ قۆناغێکدا مرۆڤ فێری کشتوکاڵ بوو؟ لە چ شوێنەوارێکدا ئاسەواری ئەم قۆناغە دۆزراوەتەوە؟

پ٥/ ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە پڕبکەرەوە:

١- زانایانی شوێنەوار و مێژووی کۆنی چاخە بەردینەکانیان دابەش کردووە بۆ: أ..............ب..............ج..............

٢- مۆری تەخت لە هەزارەی.................. پ.ز دەرکەوت.

٣- مرۆڤی کرۆمانیۆن بە .................. مرۆڤی ئێستا دادەنرێت.

# بەشی سێیەم

## میللەتە دێرینەکانی عێراق:

لە هەزارەی پێنجەمی پێش زاییندائەو کۆمەڵە مرۆڤانەی لەکوردستاندا دەژیان و لانەی شارستانیان دامەزراند کاتێك ژمارەی دانیشتوان زۆربووە لەگەڵ داهاتی ئەو ناوچەیەدا نەگونجا کۆچ بەرەو ناوەڕاست و خوارووی عێراق دەستی پێکرد و لەناوچە دەشتاییەکاندا و لەنزیك ڕووبارەکاندا نیشتەجێ بوون وردە وردە هەر کۆمەڵێك لەناوچەیەکدا جێگیر دەبوو لەئەنجامدا کۆمەڵگای سەربەخۆ لەوانی تر درووست بوو پاشان بوون بەشارە دەوڵەت هەریەکەیان سەرۆکی خۆی هەبوو.

بەهۆی پیتیەکەی و گونجاوی کەش و هەواکەی و بوونی سەرچاوەی ئاوی باش تیایدا خاکی دۆڵی ڕافیدەین دێر زەمانەوە دەرفەتی دروست بوونی ژیاری پێشکەوتوو تیایدا رەخسابوو, بەڵگە بزماریەکان (مێخیەکان) ئەم گەلانەی لای خوارەوەیان باس کردووە:

### ١- سۆمەرییەکان:

یەکێك لە گەلە کۆنەکانی دۆڵی رافیدەین کە لەچاخەکانی پێش مێژووە وەنیشتەجێ بووی عێراق بوون.

ناوی سۆمەرییەکان لەناوی هەرێمەکەیانەوە هاتوە کە دەکەوێتە باشووری عێراقەوە سۆمەرییەکان داهێنەری نووسین و ڕژێمی شارە دەوڵەت بوون و خاوەن ئەزموونی ژیاری پێشکەوتووبوون لەبواری هونەری و بیناسازی و پەیکەر تاشی و زانست و ئەدەب و ئایین.

## له شاره دەوڵەته بەناوبانگەكانیان:

وەركا، ئور، ئوما، لەگەش، ئەریدۆ، شرۆپاك، كیش.

١- **بنەماڵـەی وەركـا**: كـۆنترین بنەماڵــەی فــەرمانڕەوایی ســەردەمی بنەماڵەكانە بەناوبانگترین پادشایان (گلگامش)ە كە خـاوەنی ئـەو داسـتانەیە كە بەناوی خۆیەوە ناسراوە چیرۆكەكەی باس لەهەوڵی بەدەستهێنانی نەمری دەكات، و گەیشتن بە پلەی خواوەندەكان، بەلاّم لەكۆتایدا شكست دەهێنێت وتیّ دەگات كەنەمری بەكردەوەیە نەك بە جەستە.

٢- **بنەماڵەی ئور**: ژمارەیەك پادشا لەم بنەماڵەیەدا فەرمانڕەواییان كردووە و پاشماوەكانیان لەگۆڕستانی پادشاكانیاندا دۆزراوەتەوە، لەوانە دۆزراوە بە نرخەكانی شاژن (پوئابی) و شازادە (مس، كلام، دك) ە.

دۆزراوەكانی شاری ئور دەری خست كە(سامیەكان) وردە وردە لەنیمچە دورگەی عەرەبەوە، دەستیان كردووە بە كۆچكردن بۆ ناوچەكانی نێوان دوو روبار.



وێنەی ژمارە(٩)

شاژن پوئابی

٣- **بنەماڵـەی ئوما**: بـە ناوبـانگترین پاشـان، دوا پاشـایانە کـە هــەوڵی یەکخستنی هەموو بنەماڵەکانی داوە و توانیویەتی بۆ ماوەیـەك فـەرمانڕەوایی یەکگرتوو پێکبهێنێت وە هەموو بنەماڵەکانی تـر بخاتـە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوە ئەویش (لۆگال زاگیزی) بوو پادشای ئۆما.

٤- **بنەماڵـەی لەگـەش**: بــە ناوبــانگترین پادشــاکانی ئــەم بنەماڵەیەیــە (ئۆروکاجینا) یەکە یەکەم کەسە ژمارەیەك یاسای داناوە بۆ ڕێکخستنی بـاری ڕامیاری و ئابووری.

شەڕ لە نێوان شارە دەوڵەتی ئۆما و لەگەش لەسـەر موڵکایـەتی زەوی و زار و کەناڵە ئاودیریەکان بەردەوام بوو، لەکۆتایدا لوگالٚ زاگیزی پادشای ئۆما سەرکەوت و شارە دەوڵەتی لەگەشی خستە ژێر دەسەلآتی ئۆمـا. لەکۆتاییـدا سۆمەریەکان نـەیان تـوانی خۆیـان بگـرن لەبـەر لێشاوی کۆچـی بـەردەوامی نەتـەوە سـامیەکاندا، بۆیـە ئەکەدیـەکان توانیـان جێیـان بگرنـەوە و کۆتـایی بەدەسەلآتی سۆمەریەکان بهێنن.

## ٢- ئەکەدییەکان: ٢٣١٧ - ٢٢٣١ پ.ز:

یەکەم شەپۆلی سـامییەکانن لـە نیمـچە دورگـەی عەرەبـەوە هـاتن و لـە ناوەڕاستی عێراقدا لەپالٚ سۆمەرییەکاندا نیـشتەجێ بـوون و شـاری (ئەکـەد) یان کردە پایتەختی خۆیان و ناوەکەشیان لەناوی ئەو شارە هاتووە.

ئەکەدیەکان توانیان دەوڵەتێکی یەکگرتوو دابمەزرێنن کە زۆربەی خـاکی عێراقی گرتـەوەو پـەلی هاویـشت بـۆ ناوچـەکانی دەرەوە بـۆ وڵآتـی عـیلام و ئەنادۆلٚ و دەسەلآتیان گەیشتە دورگەی قوبرص.

سەرجۆنی ئەکەدی بەدامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی دادەنرێت.



وێنەی(١٠) سەرجۆنی ئەکەدی

بەڵام (نەرام سین)ی کوڕەزای بەناوبانگترین پاشای ئەکەدییە، و لەگەڵ لۆلۆییەکان و گۆتیەکان کە دانیشتوانی کۆنی کوردستانن جەنگاوە. ئەکەدییەکان گۆڕانکارییان بەسەر هونەری پەیکەر سازیدا هێنا و لەڕووی زمان و بیروباوەڕەوەجیاواز بوون لەگەڵ سۆمەرییەکان. دەوڵەتی ئەکەدی لەئەنجامی هێرشی گۆتیەکان بۆ سەرپایتەختەکەیان ڕووخا ساڵی٢٢٣١پ.ز.




وێنەی ژمارە (١١) نەخشەی بڵاوبونەوەی نەتەوەکانی نیمچە دورگەی عەرەب (نەتەوە سامیەکان)

## ئیمپراتۆریەتی ئوری سێیەم ٢١١١ - ٢٠٠٤پ.ز:

لەکۆتاییەکانی دەسەلاّتی گوتی شازادەیەکی سۆمەری بەناوی (ئۆتۆ حیکال) لەشاری وەرکا ڕاپەڕی دژی گوتیەکان ئەم ڕاپەڕینە هەموو شارە سۆمەرییەکانی گرتەوە، سەردەمی سەرهەڵدانی سۆمەری نوێ دەستی پێکرد.

ئۆتۆحیکال ماوەی حەوت ساڵ ونیو فەرمان ڕەوابوو پاشان ئورنەمۆ پاشای شاری ئور توانی هەموو ولاّت یەك بخات ئیمپراتۆریەتی ئوری سێیەم دامەزرێنێت کەماوەی پتر لەسەدەیەك بەردەوام بوو ناوی پاشاکانیان ئەمانە بوون:

١- ئورنەمۆ

٢- ئەمارسین

٣- ئەبی سین

پاشاکانی ئەم بنەماڵەیە بایەخی زۆریان دەدا بەخوێندن و کاری بیناسازی و هونەری ئابووری و سەربازی. یەکێ لەکارەگرنگەکانی ئورنەمۆ یاساکەیەتی کە بەناوی یاسای(ئورنەمۆ) ناسراوە.

لەکۆتایی سەردەمی دوا پاشایان ئەبی سین شالاّوی دووەمی کۆچ کردنی ئامورییەکان ڕووی کردە باشوور و ناوەڕاستی عێراق، باری ولاّتی شێواند و دەسەلاّتی سست بوو بەلاّم ئەم ئیمپراتۆریەتە لەئەنجامی هێرشی هاوپەیمانی عیلامی ـــ سوئی* ڕووخا، کاتێك عیلامییەکان لەباشووری ئێرانەوەو

سوئیەکان لەکوردستانەوە پێکەوە هێرشیان کردە سەر ئوری پایتەخت ساڵی٢٠٠٤پ.ز.

پاش ڕووخاندنی ئەم ئیمپراتۆرییەتە ماوەیەکی نادیار لەمێژووی عێراقی کۆن دەست پێ دەکات پێ دەوترێت سەردەمی (ئیسن ـــ لارسا) تاهاتنی حامورابی بۆ سەر حوکم ساڵی١٧٩٤پ.ز.



وێنەی ژمارە (١٢) شا ئورنەمۆ ئامێرەکانی کێشان و پێوانە لە خواوەندی مانگ وەردەگرێت

## ٣- سەردەمی بابلی کۆن و هاتنی ئامووریيەكان ١٨٩٤ - ١٥٩٥پ.ز:

لەئەنجامی شەڕو ئاژاوەی نێوان بنەماڵەی ئیسن و لارسا کۆمەڵێك لەئامووریيەكان لەسوریاوە بەرەو ناوەڕاستی عێراق هاتن و لەشاری بابل نیشتەجێ بوون توانیان دەوڵەتێکی نوێ دابمەزرێنن کە ناسراوە بە دەوڵەتی بابلی یەکەم، یان سەردەمی بابلی کۆن , ئاموریەکانیش هەر لە نەتەوە سامییەکان بوون کە سەرەتا ڕوویان لە شام (سوریا) کردبوو.

## ( حامورابی ) ١٧٩٤ - ١٧٥٢پ.ز:

دوای ئـەوەی بنەماڵـەی لارسـا تـوانی بنەماڵـەی ئیـسن لەناوبـەرێت و بنەماڵەی لارسا خۆشی بێ هێزو لاوازبوو، حامورابی، شەشەم پاشای بابل توانی دەست بگرێت بەسەریدا و دەسەلاَتیان نەهێڵێ (حـامورابی) سـەرەڕای یەکخستنی ولاَت گەلێك کاری شارستانی کردووە، بەلاَم گرنگترین کـاری ئـەم پاشایە ئەو کۆمەڵە یاسایانەیە کە بەناوی خۆیەوە ناسراون.

## یاساکانی حامورابی:

لەسەر میلێکـی ڕەش تۆمـارکراون لەبەشـی سـەرەوە وێنـەی حـامورابی پیـشان دەدات لەبـەردەم خواوەنـد (شەمەش) خواوەنـدی ڕاسـتی و داد یاسـاکانی لێـوەردەگرێ. وە بەشـی خوارەوەی ٢٨٢بڕگە یاسای تیادایـە هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە.



وێنەی ژمارە(١٣) حامورابی

حامورابی توانی سوود لە یاسا کۆنەکانی عێراق وەربگرێت و کۆیان بکاتەوەو نوێکاری تیایدا بکات. ماوەی٤٢ساڵ فەرمانڕەوای عیراقی کردووە.



وێنەی ژمارە( ١٤ ) میلی حامورابی

## ٤- ئاشـوریــەکــان:

لقێکن لە نەتەوە سامیەکان لەنیمچە دوورگەی عەرەبـەوە کۆچیان کـرد لەباکووری خۆرئاوای عێراق لەسەر ڕۆخی ڕوباری دیجلە نیشتەجێ بوون. ناوەکـەیان لـەناوی خواوەنـدە سـەرەکییەکانەوە(ئاشـوور) هـاتووە ویەکـەم پایتەختیان هەر بەو ناوە ناسراوە.

لەسەرەتای دەرکـەوتیان لەمێـژوودا لەهـەزارەی سـێیەمی پـێش زایـینی نەیان توانی فـەرمانڕەوایی خۆیـان بـچەسپێنن بـەهۆی بـەهێزی بنەماڵـەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق، وسـوبارییەکان و خورییـەکان لـە کوردسـتان و حیثیەکان لەئەنادۆڵ. بەڵام لەهـەزارەی دووەمـی پـێش زایینـەوە دەرکـەوتن وەکو گەلێکی خاوەن دەسەڵات لەڕووی جەنگ و داگیرکردنەوەو ئـەزموونێکی پێـشکەوتوویان هـەبوو لـەڕووی داهێنـان و شارسـتانیەت دا، سـەردەمەکانی فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان دابەش دەکرێت بۆ سێ سەردەم:

١– سەردەمی ئاشووری کۆن ٣٠٠٠ ــ ١٥٠٠پ.ز

٢– سەردەمی ئاشووری ناوەند ١٥٣٠ ــ تا سەرەتای سەدەی نۆیەمی پـێش زایین.

٣– سەردەمی ئاشووری نوێ لەسەرەتای سەدەی نۆیەمی پێش زاینیـەوە – تا ڕووخاندنی دەوڵـەتی ئاشـووری لەسـەر دەسـتی هاوپـەیمانێتی میـدی کلدانی ساڵی٦١٢پ.ز .

لەپاشا بەهێزەکانی ئاشوورییەکان:

| | |
|---|---|
| شەمشی ئەدەدی یەکەم | ١٨١٤ــ ١٧٨٢ پ.ز |
| شەلمانسەری سێ یەم | ٨٥٨ ــ ٨٥٤ پ.ز |
| شەلمانسەری پێنجەم | ٧٦٢ــ٧٢٢ پ.ز |
| سەرجوونی دووەمی ئاشووری | ٧٢١ــ ٧٠٥ پ.ز |
| سەنحاریب | ٧٠٤ــ٦٨١ پ.ز |
| ئەسەرحەدوون | ٦٨١ــ٦٦٩ پ.ز |
| ئاشوور بانیباڵ | ٦٦٨ــ٦٢٧ پ.ز |





وێنەی (١٥) سەرجۆنی دووەمی ئاشوری ئاشوربانیباڵ



وێنەی ژمارە (١٦) گای باڵدار نموونەی
بەهێزی و ئازایەتی ئاشوورییەکان

## ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشووری:

بەهۆی بەرفراوانی دەوڵەتەکەیان، بڵاوبوونەوەی سوپاکەیان بەهەموو هەرێمەکاندا، ئاشوورییەکان وردە وردە مەرکەزییەتیان لەدەست دا بەتایبەتی پاش مردنی ئاشوور بانیباڵ چەند پادشایەکی لاواز و بێ هێز هاتنە سەر حوکم.

لەم کاتەدا، لە چیاکانی زاگرۆس لە کوردستان، دەوڵەتی میدیا لە لووتکەی هێزو توانای دابوو بە تایبەتی لەسەردەمی (کەیخەسرەو)ی میدی کە توانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ پاشای کلدانی لەبابل ((نەبوبلاسەر)) ببەستێت و پێکەوە هێرشیان کردە سەر (نەینەوا) پایتەختی ئاشووریەکان و ڕووخاندیان لەساڵی٦١٢پ.ز.

## سەردەمی بابلی نوێ (کلدانیەکان) ٦٢٦ ـــ ٥٣٩پ.ز:

لــە کۆتاییــەکانی ســەردەمی فــەرمانڕەوایی پاشــای ئاشــووری (ئاشــور بانیبــاڵ) و لەشــاری بابــل دەوڵــەتێکی ســەربەخۆ دەرکــەوت کەپێــشتر ســەر بەئاشوورییەکان بــوون، و ســەربەخۆیی ڕاگەیانــد لەســەردەمی نەبوبلاســەری کلدانی ساڵی ٦٢٦پ.ز .

شاری (بابل) پایتەختی ئــەم ئیمپراتۆرییەتــە بــووە و بــوو بەگــەورەترین بنکەی شارستانی لەجیهانی کۆندا، هاوپەیمانی کلدانیەکان لەگەڵ میدییەکان کەلەسەردەمی (نەبوبلاسەر) بەسترا تا سەردەمی کوڕەکەی (نەبوخەدنەسر) بەردەوام بوو، ئەویش لەڕێگەی ژن و ژن خوازیەوە کە لەنێوانیاندا بوو، بەڵام لەدوایــدا هەڵوەشــایەوەو کــاری پێنــەکرا. لەســەردەمی(نەبوخەدنەســر)دا سنووری دەوڵەتی بابلی گەیشتە کــەنارەکانی دەریــای ناوەڕاســت (ســوریا و لوبنان و فەلەستینی گرتەوە)، لەئــەنجامی شۆڕشــی جوولەکــەکانی دەوڵــەتی (یــــە هــــوذا) دووجــــار هێرشــــی کــــردە ســــەریان. بــۆ جــاری دووەم شــاری(ئورشــەلیم)ی گــرت و چــل هــەزار جوولەکــەی بەبەنــدی هێنــا بــۆ بابــل ئەمــەش بــە(تــاڵانی بابــل) ناســراوە بــەواتای تــاڵانی بابلیــەکان بــۆ شــاری ئورشەلیم. ( نەبوخەدنەسر) بایــەخی زۆری دەدا بــەکاری بیناســازی و پــێش کــەوتنی دەوڵەتەکــەی. لــەپاشماوە بەناوبانگــەکانی ئــەم پاشــایە: باخــچە هەڵواســـراوەکانی بابــل وشــەقامی کــەژاوەکان(شــارع الموکــب) و کۆشــك و شوراکانی شــاری بابــل و دەروازە کانیــەتی بــە تایبــەتی دەروازەی عەشــتار. پاش نەبوخەدنەسر چەند پاشایەکی لاواز هاتنە ســەر حــوکم کەنــەیان تــوانی پارێزگــاری دەوڵەتەکــەیان بکــەن، لەئەنجامــدا لەســاڵی ٥٣٩پ.ز کۆرشــی ئەخمینی(هەخامەنشی) هێرشی کردە سەر بابل و داگیری کردو کۆتایی هێنــا بە دەسەلأتی کلدانی.

## پـــرسيـــارەكـــان

پ١/ ئەم ڕستانەی لای خوارەوە پڕ بكەرەوە:

١- ناوی سـۆمەریەكان لـە ..................................

هاتووە كە دەكەوێتە ....................

٢- لەشارە دەوڵەتە بەناوبانگەكانی سۆمەرییەكان شارەكانی:

١. ......................    ٢. ......................

٣. ......................... .

٣- سۆمەرییەكان نەیان توانی خۆیان بگرن لەبەرلێشاوی كۆچـی بـەردەوامی ....................................

٤- ............................... بـــە دامەزرێنـــەری دەوڵـــەتی ئەكەدی دادەنرێت.

٥- دەوڵەتی ئەكەدی لەئـەنجامی هێرشـی ...................... بـۆ سەر پایتەختەكەیان ڕووخا ساڵی ٢٢٣١پ.ز.

پ٢/ پێناسەی ئەمانەی لای خوارەوە بكە:

١- سۆمەرییەكان.

٢- ئەكەدییەكان.

٣- ئاشوورییەكان.

٤- كلدانییەكان.

پ٣/ نیشانەی (✓) بۆ ڕستە ڕاستەکان دابنێ و (✗) بۆ رستە هەڵەکان:

١- گلگامێش یەکێکە لەپاشا بەناوبانگەکانی بنەماڵەی لەگەش.

٢- ئورنەمۆ دامەزرێنەری بنەماڵەی ئوری سێیەمە.

٣- پاشا حامورابی یەکەم دانەری یاسایە لە عێراقی کۆندا.

٤- شاری نەینەوا لەساڵی٧١٥پ.ز لەسەر دەستی مادەکان و کلدانییەکان ڕووخا.

٥- سۆمەرییەکان داهێنەری نوسینن.

# بەندی دووەم
## میللەتە دێرینەکانی کوردستان

### بەشی یەکەم:

### ١- لولوییەکان:

لولوییەکان کۆمەڵێکی چیا نشینی نیشتەجێی بەشی باکووری زنجیرە چیای زاگرۆس بوون، کە لەنێوان هەزارەی دووەمی پ.ز تا سەدەی نۆیەمی پ.ز توانیان دەسەلاتی خۆیان بەسەر ناوچەکانی زەهاو و شارەزوور و (ناوچەی سلێمانی ئێستا) بسەپێنن ولاتەکەیان لای ئاشوریەکان بە (زاموا) ناسراوە لەڕووی نەژادەوە دەچنەوە سەر نەتەوە هیندۆ ـ ئەوروپیەکان کە ناسراون بە(ئاری) نەژاد.

دەنگوباسی ئەم ڕەگەزە کۆنەی کورد لەچەند سەرچاوەیەکی ئەکەدییەوە پێمان گەیشتووە، لەو سەرچاوانە نامەیەکی سەرجۆنی ئەکەدی (٢٥٣٠پ.ز) هەروەها لەسەر مۆرێکی لوولەیی کە لەم دواییانەدا دۆزراوەتەوە ئاماژە بۆ بەگژداچوونی لولوییەکان دەکات بەرامبەر داگیرکەرانی ئەکەدی. هەروەها بە توندی بەرپەرچی شالاوە سەربازییەکەی(نەرام سین) یان دایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەکەدییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ناوچەکەیان داگیرکردو ئەم ڕووداوەشیان لەسەر میلێك بەناوی میلی سەرکەوتن تۆمار کرد لەناوچەی قەرەداغ لە دەربەندی گاور.

لولوییەکان توانیان خۆیان لەژێر دەستی ئەکەدیەکان رزگار بکەن دوای مردنی نەرام سین، ئەوەبوو پاشای لولوییەکان (ئانویانینی) توانی شکستێکی گەورە بەسەر ئەکەدیەکان دا بهێنی ، ئەویش ئەم سەرکەوتنەی

له چیای (بادیر) له ناوچەی (سەرپیل زەهاو) لەرۆژهەلاتی کوردستان لەسەر گاشه بەردێك تۆمارکرد.

لولوییەکان چەند پاشماوه و کارێکی هونەری ڕەنگینیان له ولاتی خۆیان بەجێ هێشتووه که گەواهی ئاستی بەرزی شارستانێتی ئەوان پیشان دەدەن، ئەمانه له هونەری بیناسازی دا ناوبانگیان دەرکرد لەسەردەمی ئاشوریەکان، هەربۆیه پاشاکانی ئاشوری ژمارەیەکی زۆریان بردن بۆ شارەکانی خۆیان و لەوێش وەك وەستاو پەیکەرتاش ناسران، لەم شارانه ژمارەیەك بیناو پەیکەریان دروست کرد.



وێنەی ژمارە(١٧) میلی سەرکەوتنی ئانوبانینی

## ٢- گوتییەکان:

کوردستان دادەنرێت بەنیشتمانی یەکەمی ڕەچەڵەکی مرۆڤی دووەم. ئەمەش دوای ئەوەی کە کۆمەلآنی مرۆڤ لەنیشتمانە ڕەسەنەکەیانەوە کۆچیان کرد بۆ نیشتمانە نوێیەکەیان کە لەوەوپێش کۆمەڵی گەلانی زاگرۆسی تیا دەژیا کە پێك هاتبوون لە سوباری ولولو وگوتییەکان و هۆرییەکان (میتانیەکان) وکالدیەکان (خلدییەکان) کە هەموویان بەڕەچەڵەك لەگەڵ یەکدا هاوبەش بوون، هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ کۆمەڵی گەلانی هیند و ئەوروپی، ئەم تیرانە هەموویان پێکەوە ڕەسەنی یەکەم و کۆنی گەلی کوردن. لەکوردستاندا کەژینگەیەکی شاخاوییە ئەم نەتەوانە لەپاڵ یەکدا ژیاون و زمانی تایبەتی خۆیان هەبووە، داب و نەریتی کۆمەلآیەتیان پەرەی سەندووە و شارستانی خۆیان دامەزراندووە، گوتییەکان کە کۆنترین ئەم تیرانە بوون لە کۆتاییدا توانیان لەپێش٢٠٠٠پ.ز مەملەکەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن. گوتییەکان هێزەکانیان یەك خست و دەستیان گرت بەسەر ئەو زەویانەی نزیك دەسەلآتیان بوون. و لەژێر ڕکێفی یەك سەرکردەدا خۆیان سازدا بەو جۆرە، یەکەم دەوڵەتی کوردی لەمێژوو دا دروست بوو کە بەناوی ولآتی(گوتیام) وە ناسراوە، گوتیام لەزمانی ئاشووریدا بەناوی (زەوی جەنگاوەرەکان) دێت. ئارابخا (کەرکوکی ئێستا) پایتەختیان بووە، سنورەکەیان لە نێوان زێی گەورەو سیروانددا بووە.

گۆتییەکان ساڵی ٢٦٤٩پ.ز ولآتی (سۆمەر و ئەکەد)یان داگیر کرد، لەسەردەمی پاشای گوتییەکان(ئیلولومیش)، بەو جۆرە سنوری دەوڵەتەکەیان فراوان بوو، پادشاکەیان بە(فەرمانڕەوای چوارلای جیهان) و (پاشای بەهێزی ئەکەد) ناوبانگیان دەرکرد، دەسەلآتی گوتییەکان بەسەر

ولاّتی سۆمەر و ئەکەدەوە نزیکەی سەدەو چارەگە سـەدەیەکی خایانـد لـەم ماوەیەدا (٢١) پاشای گۆتی حوکمی کردووە کە (تریگان) دوا پاشا بوو پـاش سـالّی ٢٥٢٤پ.ز دەسـەلاّتی گۆتییـەکان وردە وردە بـەرەو لاوازی هـات و لە ئەنجامـدا دەسـەلاّتیان لە دەولّەتی سۆمەر و ئەکەد لە دەسـت دا و گـرنگترین هۆکـانی کـەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ:

١- دووری ئەو ناوچانەی دەستیان بەسەردا گرتبوو لە مەلّبەنـدی دەسـەلاّتی خۆیانەوە.

٢- لاوازی ناردنی یارمەتی سەربازی و درەنگـی گەیـشتنیان بـۆ ئـەو شـوێنە دوورانە.

لە گرنگترین ئەو کارە هونەریانەی کە ئاستی بەرزی شارسـتانێتی گۆتیـەکان پیشان دەدات:

١- تابلۆی لیشیر - پیرانی لە هۆرین شێخان (باکوری خانەقین).

٢- سەری یەکێ لە پاشاکانی گۆتی کە لە برۆنز دروستکراوە لـە دەورپـشتی شاری هەمەدان لە ئێران دۆزرایـەوەو ئێـستاش لـە مۆزەخانـەی (بریمـەر کالیری) لە شاری نیویۆرک ئەمریکا پارێزراوە.

٣- هەروەها سەری یەکێ لە پاشاکانیان لە سەلماس (ڕۆژهەلاّتی کوردستان) دۆزرایەوە لەگەلّ دۆزینەوەی چەند مۆرێکی لولەیی لـە باشـوری ئێـستای عێراق.

حوکمرانی گۆتییەکان لە ولاّتی سۆمەر و ئەکەد لەسەر دەستی (ئۆتۆحیکال) پاشای سۆمەری کۆتایی هات.

## ٣- میتانیەکان:

ئـەم نەتەوەیـە لـە هۆریـەکان (خۆریـەکان) بـوون کـە لەکوردسـتانی خۆرئاوادا سەرەتای نیشتەجێ بوونیـان دەوروبـەری ڕوبـاری بلـێخ و خـاپوور بوو، سەرەتای دەرکـەوتنیان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی چـواردەیەمینی پ.ز میتانیەکان بەڕەگەز ئاری نەژادن شاری واشوکانی (رأس العین لـە ڕۆژئـاوای کوردسـتان) پایتـەختیان بـوو میتانیـەکان لەگـەڵ میـسریەکاندا پەیوەنـدیان هەبووە و نامە گۆڕکێیان لەگەڵ میسریەکاندا هەبووە بەتایبـەت لەسـەردەمی پاشـای میتانیـەکان (توشـراتا) و فرعەونـەکانی میـسر، ولآتـی میتـانی بـە ناوی(خانیگلبات لە لایەن ئاشوریەکان) بەناوبانگ بـوو، لەناوچـەی کـەرکووك ژمارەیـەك بەڵگەنامـەی دەوڵـەتی میتـانی دۆزراونەتـەوە، ڕۆژهـەلآت نـاس (جۆنس) دەڵێت وشەی میتانی بە واتای (خانەدان) دێت.

میتانیەکان لەگەڵ ئاشوریەکاندا بەردەوام لەجەنگدا بـوون لەسـەردەمی شا شەلمانەسری یەکەم ١٢٧٣ ــ ١٢٤١پ.ز دەسـەلآتیان هەرەسـی هێنـاوە. میـسریەکان بەمیتانیـەکانیان وتـووە (نـەهارین) و لـە تەوراتـدا بـە (ئـارام - نەهارام) ناوبراوە.

## ٤- کاشیەکان:

چەند خێڵێکی نیشتەجێی چیاکانی زاگرۆس بوون بەتایبەت لـە ناوچـەی (کرماشـان و لوڕسـتان)دا ژیـاون و پـەلیان بـەرەو ولآتـی دوو ڕووبـار (نـاوەراسـت و بـاشـووری عـێراق) هـاویـشتـووە و بـەسـەرکـردایـەتـی شا (ئاگومی دووەم) دەسەلآتیـان بەسەر ولآتی بابل دا گرتووە بۆ مـاوەی چوار سەدە لە نێوان ١٥٩٥ ــ ١١٦٢ پ.ز بە هۆی هێرشی پاشاکانی بابل بۆ سەر نـاوچەکەیان. کاشیـەکان بۆ یەکەم جار ئەسپیان هێنـایە دۆڵی رافـیدەین و

هەنگاوێکی گەورە بوو لە پێشخستنی شارستانیدا. دەوڵەتەکەیان بەناوی کاردونیاش بەناوبانگە پێ دەچێت ناوی کاشیەکان لەناوی خواوەندەکەیانەوە هاتبێت کە ناسراوە بە(کاشو) لە عێراقدا کاشیەکان پایتەختی نوێی خۆیان دروست کرد و بە ناوی پادشا بەناوبانگەکەیانەوە ناویان نا (دورکوریکالزۆ) واتە شاری کوریکالزۆ، کە ئیستا لە نزیك شاری بەغداد پاشماوەکانی ناسراوە بە(عەقەرقوف) و زەقورە بەناوبانگەکەی تا ئیستا ماوە و لە سێ نهۆم دروست کراوە بە بەرزی دووسەد پێ و بەنەخش و شێوازی جوان و وێنەی کوریکالزۆی تیادا بەدی دەکرێت. هەر لەم شارەدا سێ پەرستگای گەورە دۆزراونەتەوە. کاشیەکان زۆر بایەخیان بەئەسپ سواری داوە بەخێوکردنیان بەشتێکی پیرۆز زانیوە. هەروەها کاشیەکان دەستێکی باڵایان هەبووە لە هونەری بیناسازی و نەخشەسازی و ڕێگا ـ کێشان دا.لەدەوروبەری ساڵانی ١١٦٢پ.ز عیلامیەکان توانیان هێرش بهێننە سەر کاشیەکان و پایتەختەکەیان کاول بکەن سامانێکی زۆر و کارە هونەریە گرنگەکان بگوێزنەوە بۆو پایتەختەکەی خۆیان(سوسە).

## بەشی دووەم

### میدییەکان:

پاش تەواو بوونی حوکمڕانی گۆتیەکان، لەدەوروبەری ساڵانی ۲۰۰۰پ.ز شەپۆلێکی گەورەی هیندۆ ئەوروپییەکان لەناوچەی زاگرۆس گیرسانەوە و تێکەڵاو بەگۆتییەکان بوون ولەگەڵیاندا توانەوە،ئەمانە بە میدییەکان ناسران، و یەکەمین ئیمپراتۆریەتی مەزن لەمێژووی کۆنی کوردا دابمەزرێنن کە سنووری لەخۆرهەڵاتەوە تێپەڕی کرد بۆ ڕوباری (سەرداریا) لەئاسیای ناوەڕاست، لە باکوریشەوە تا دەریاچەی قەزوین و دەریای ڕەش، لە ڕۆژئاواشەوە تا ڕوباری هالیس (قزل ئیرماق) درێژ بۆوە.

لە خوارووشیدا چیای حەمرین سنووری بوو ساڵی ٦٥٠ پ.ز بەتەواوی دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت، بەمەش توانیان کەبنچینەیەکی بەهێز بۆ حکومەتێکی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنن، میدیەکان کە ئەم کارەیان بۆ چووە سەر کەوتنە پەل هاویشتن و داگیرکردن.



وێنەی ژمارە (۱۸)

چەند پیاوێکی (مادەکان) یان (ماننا)، سەدەی هەشتەمی پ.ز

نێوانی هەردوو دەوڵەتی میدیا و ئاشووری هەمیشە جەنگی بێ پسانەوە بووە، ساڵی٧١٥پ.ز پادشای ئاشووری سەرجۆن توانی میدیەکان بشکێنێت و باجیان لێ بستێنێ،پاش ئەوە پاشای میدیەکان (دیاکۆ) شاری (ئەکباتانا) (هەمەدانی ئێستا) ی کردە پایتەختی میدیا ساڵی ٧٠٠پ.ز. پاش مردنی دیاکۆ، (فراورتس)ی کوڕی حوکمی گرتە دەست، فراورتس لەگەڵ ئاشووریەکان پەیمانی ئاشتی بەست، ئەم کارە ڕێی بۆ خۆش کرد دەست بەسەر فارسەکاندا بگرێت.

## کیاکسار( کەی خەسرەو ) ٦٥٣ - ٥٨٥پ.ز:

بەناوبانگترین پادشاکانی میدیایە، لەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی میدیا گەیشتە ئەو پەڕی دەسەلآت و لوتکەی گەشەکردن.



وێنەی ژمارە (١٩)

لە کۆتایی ساڵی ٦١٥پ.ز میدیەکان هۆز و تیرەکانیان کۆکردەوە و دەستیان کرد بەهێرش بەرەو سنووری خۆرهەلآتی ئاشوریەکان هەر لەو

سـالەدا توانیـان شـاری (ئارابخـا ـــ کـەرکوکی ئێـستا)وئـەربائیلۆ(هـەولێری ئێستا) رزگار بکەن.

سـالّی ٦١٤پ.ز بەتـەواوی هێزەکانیـان بـەرەو شـارو مەڵبەنـدەکانی ئاشوریەکان بـەڕێ کـەوتن، لـەم کاتـەدا پادشـای میـدیا (کیاکسار) و (نـەبو بلاسەر) ی و پادشـای کلـدانی پەیمانبەسـتنێکیان کەوتـە نێـوان بـۆ لێـدان و لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری.

هەردوو سەرکردە یـەك ئامانجیـان هـەبوو ئـەویش ڕووخانـدنی دەوڵـەتی ئاشوری بوو، لە کۆتایی سالّی٦١٢پ.ز پـاش گـەمارۆدانی شـاری (نەینـەوا)ی پایەتەخت توانیان داگیری بکـەن و پاشـان شـاری (ئاشـور) و (نـەمرود) یـان داگیرکـرد، ئـەوەی لێـرەدا پێویـستە ئامـاژەی بـۆ بکرێـت لەسـەردەمی ئیمپراتۆریـەتی میدیەکانـدا (زەردەشـت) پێغەمبـەری میدیـەکان دەرکـەوت و ئایینی زەردەشتی بلاّوکردەوە.

## زەردەشـــت:

زەردەشت بەڕەگەز میدییە و سالّی٦٦٠پ.ز لە ناوچەی ( ئەترۆپاتین) لە ڕۆژئاوای دەریاچەی ئورمیە لەدایك بووە، ئایینی زەردەشتی بووە بە ئـایینی ڕەسمی دەولّەتی میدیا.

## کۆتـایی دەوڵەتی میدیا:

سالأنی ٥٥٣ ـــ ٥٥٠پ.ز لەسـەردەمی ئاسـتیاك دوا پادشـای میدیـەکان، فارسـە (هەخامنـشیەکان) بەسـەرکردایەتی (کـۆرش) سـەریان هەڵـداو وەکـو هێزێکـی نـوێ لەناوچـەکە دابەیـدا بـوون، کـۆرش کەوتـە ململانـێ لەگـەڵ میدیەکاندا و توانی بەیارمەتی سەرکردەیەکی میدییەکان بـە نـاوی (هارپـاك) دژی ئاستیاك بکەوێتە جەنگەوە و شاری (ئەکباتانا) داگیربکـات وکۆتـایی بـە دەولەتی میدیا بهێنێت.

## پرسیارەکانی بەندی دووەم

پ١ / پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

(لۆلۆییەکان، زاموا، نەرام سین، ئارابخا، نەهارین، عەقەرقوف، گاندیش، دیاکۆ، هارپاک، ئاستیاك).

پ٢ / بەکورتی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- لەسەر کاشیەکان ئەمانەی خوارەوە روون بکەرەوە:

أ- شوێنی نیشتەجێ بوونیان.

ب- ناوی کاشیەکان لەچی یەوە هاتووە.

ج- چی دەزانی لەسەر عەقەرقوف باسی بکە.

د- چۆن دەسەڵاتیان لەناوچوو.

٢- لەسەر میتانیەکان:

أ- باس لەپەیوەندی نێوان میتانیەکان و ئاشوریەکان بکە.

ب- باس لەپەیوەندی نێوان میتانیەکان و میسریەکان بکە.

٣- لەسەر دەوڵەتی ماد ئەم برگانە ڕوون بکەرەوە:

أ- شوێن و سنوری ئەم دەوڵەتە دیاری بکە.

ب- چۆن ئەم دەوڵەتە کۆتایی پێ هات.

ج- ئایینی میدیەکان چی بووە.

پ٣ / ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:-

١- لۆلۆیەکان نیشتەجێ بوون لەبەشی .......... چیای زاگروس لەنێوان هەزارەی .......... پێش زایین و دەسەڵاتیان گەیشتبووە ناوچەکانی ..........و.......... .

٢- گۆتیـەکان دەسـەڵاتیان گەیشتە شـارەکانی باشـوور لەسـەردەمی پاشـا ........... وەماوەی ............. خایاند دەسەڵاتەکەیان.

٣- میتانیـەکان نیـشتەجێ بـوون لەبەشـی .............. کوردسـتان دوای جێ هێشتنی چیاکانی زاگرۆس.

٤- ڕۆژهەڵاتناس جۆنس دەڵێت وشەی میتانی بە مانای .......... دێت بۆ .............. بەکارهاتووە.

٥- کاشـیەکان چـەند نـاوێکی تریـان هـەبووە و پێـوەی ناسـراون وەك .......... و .......... و ........ .

٦- دەوڵەتی میدیای مەزن لە دەوروبـەری سـاڵی............. پـێش زایـین دامـەزرا لـە بەشـی ............ کوردسـتان وە شـاری............ کرایە پایتەختی ئەم دەوڵەتە.

# بەندی سێیەم

## شوێنەوارە دێرینەکانی کوردستان

### کوردستان:

بۆ یەکەم جار ناوی کورد هاتبێت لەسەر چاوە بزمارییەکان(مێخییەکان)دا، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زایینی کاتێك باس لە شوێنێك دەکات بەناوی ولأتی کوردا.

بەلأم وشەی کوردستان بۆ یەکەم جار لەسەدەی دوانزەیەمی زایینی بەکارهاتووە. ئەویش لە دوو بڕگەپێك دێت: (کورد) کە ئامـاژە بـە نەتـەوەی کورد دەکات و (ستان) بە واتـای ولأت یـان هـەرێم یـان شـوێن دێت. کەواتە کوردستان مانای (ولأتی کوردان) دەگەیەنێت. خاکی کوردستان هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە باکوری چیاکانی زاگرۆس، باکورو باکوری ڕۆژهەلأتی دۆلی ڕافیدەین(میسۆپۆتامیا) تا کەناری دەریای ناوەڕاست، و ڕۆژهەلأتی بانی ئەنادۆلّ تا دامێنی چیای حەمرین.




وێنەی ژمارە(٢٠)

نەخشەی کۆنی کوردستان

## گرنگترین شوێنەوارە دێرینەکانی کوردستان:

١- **ئەشــــکەوتی شـــــانەدەر:** گـــەورەترین و بـــەناوبانگترین ئەشـــکەوتەکانی کوردستانە دەکەوێتە چیای برادۆست لە پارێزگای هـەولێر، لـە سـالأنی نیـوان ١٩٥١ ـــ ١٩٦١لـە لایـەن تیمێکـی ئـەمریکی پـشکنینی لێ کـراوە، مێژووی ئەم ئەشکەوتە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نێـوان(٦٠ ـــ ٤٥)هـەزار ساڵ، مرۆڤی نیاندرتاڵ تیایدا ژیاوە بۆ قۆناغی چاخی بەردینی کۆن دا.



وێنەی ژمارە (٢١) ئەشکەوتی شانەدەر

٢- **ئەشــکەوتی هــەزارمێرد:** ئەکەوێتــە دووری ١٣کـم لـە باشـووری ڕۆژئـاوای سلێمانی لە شاخی بەرانان، لەلایەن شوێنەوار ناسێکی ئەمریکی پشکنینی لـێ کـراوە سـاڵی١٩٢٨ز، مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ٥٠,٠٠٠ سـاڵ بـۆ قۆناغی چاخی بەردینی کۆن.

٣- **ئەشکەوتی زەرزی:** ئەکەوێتە زنجیرە چیای سەرسەرد نزیك گونـدی زەرزی لە چەمی ڕەزان لە پارێزگای سلێمانی، مێژووەکەی دەگەڕێتـەوە بۆ ١٢٠٠٠ دوانـزە هـەزار سـاڵ واتە بۆ چاخی بەردینی کۆن.

٤- **چەرمـــۆ:** ئەکەوێتـە دووری١١کم لەڕۆژهـەڵاتی شـاری چەمچەماڵ لەسـەر چەمی گەورە یەکێکە لە لقەکانی روباری ڕۆخانە و تاووغ چای لە پارێزگای کـەرکوك شـوێنەواری چـەرمۆ کـۆنترین گونـدی کشتوکاڵییە لـە جیهانـدا، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ (هەزارەی حەوتەمی پێش زایین).

خەڵکی گوندی چەرمۆ ئاژەڵیان ماڵی کرد، و گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و پاقلـە یـان چـاند گلێنـەیان (قاپ) دروسـت کـرد و خانوویـان دروسـتکرد. هـەروەها پەیکەری خواوەندیان درووست کرد بەشێوەی بوو کەڵـەی قـوڕین ئامـاژە بـە خواوەندی دایك دەکات.

٥- **میلەکەی دەربەندی گاور:** ئەکەوێتە یەکێك لە دەربەندەکانی چیای قەرەداغ لە سلێمانی نزیك گوندی تەکیە و بەلەکجاڕ.

ئەم میلە هەڵکـەنراوە لەبـەردی دەربەندەکـە وێنـەی پاشـایەك پیـشان دەدات لەوانەیـە (نـەرام سـین) بێـت، یـان (ئانوبـانینی) پاشـای لۆلۆییـەکان لەکاتی سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانی دا. جێگەی باسە ئەم میلە نووسـینی پێوە نییە.



وێنەی ژمارە (٢٢) نەخشەی هەندێ لە گرنگترین شوێنەوارەکانی کوردستان

## ٦- میلەکەی ئانو بانینی:

ئەکەوێتە سەر شاخی بادیر لەناوچەی سەرپیل زەهاو لە رۆژهەلاتی کوردستان. وێنەی پاشای لۆلۆیی ئانوبانینی پیشان دەدات لەکاتی سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانی دا، هەروەها هەندێ نووسینی بزماری(مێخی) پێوەیە بەزمانی ئەکەدی باس لەم رووداوە دەکات.

## ٧- ئەشکەوتی قزقاپان:

ئەکەوێتە نزیك ئەشکەوتی زەرزی لە زنجیرە چیای سەرسەرد نزیك



وێنەی ژمارە(٢٣) کیاکسار

لە داتاشراوەکەی قزقاپان

گوندی زەرزی لەچەمی ڕەزان، بریتییە لە گۆڕێکی سێ ژووری لە بەردی شاخەکە هەڵکەندرا وە، پێشەکەی نەخشێکی لێ هەڵکەندراوە دیمەنی

دووپاشای لەسەرە لەڕێ و ڕەسمی ناشتندان، مێژووی ئەم نەخشە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتورییەتی میدیا (٧٠٠ ــ ٥٥٠پ.ز).

## پرسیارەکانی بەندی سێیەم

١–چەرمۆ چییە؟ دەکەوێتە کوێوە؟ گرنگی لە چییدایە؟

٢– ئەشکەوتی هەزارمێرد دەکەوێتە کوێوە وە گرنگی لە چییدایە؟

٣– دەربەندی گاور گرنگی چییە؟

٤– ئەشکەوتی قزقاپان بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە؟

**چالاکی:**

گروپێك لە قوتابیان بە یارمەتی مامۆستای وانە.... نەخشەیەکی مێژوویی بۆ دەست نیشانکردنی (شوێنەوارەکان) ئامادە دەکات..

# بەندی چوارەم

## بەشی یەکەم

## ئێران لە سەردەمی ئەخمینیەکان ( هەخامەنشیەکان )

لە دەوروبەری ساڵی ٨٠٠پ.ز فارسەکان لە دەوروبەری دەریای قەزوین هاتن بۆ ناوچەی (پارس) لە باشوری ئێران نیشتەجێ بوون و ماوەیەکی زۆر ملکەچی میدیەکان بوون.

لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پ.ز لە ئەنجامی یەکگرتنی هۆزە فارسەکاندا یەکەم دەوڵەتی فارسی دامەزرا لەسەر دەستی (ئەخمینس).

### کۆرشی دووەم ٥٥٨ - ٥٣٠پ.ز:

پاش پاشا قەمبیز کۆرشی دووەم دەسەلاتی دەوڵەتی هەخامەنشیەکانی گرتە دەست لەژێر نازناوی کۆرشی گەورە، و لەو سالانەدا

ملکەچی کیاکساری پادشای میدییەکان بووە. بەلام لەساڵی٥٥٠پ.ز توانی دژی دەسەلاتی میدییەکان بوەستێت و دەوڵەتی میدیا بڕوخێنێت و ئەکباتانا داگیر بکات و هەموو گەنجینەکانی بە تالان ببات. کۆرش لەو ساتانەدا بەناوی پادشای میدیا خۆی ناساند بۆیە میسریەکان و یۆنانیەکان بەو نازناوە مامەڵەیان لەگەڵدا گرتووە.

کردەوە جەنگیەکانی کۆرشی گەورە زۆر و گرنگن وەك ڕووخاندنی دەوڵەتی میدیا ساڵی ٥٥٠پ.ز ، و ڕووخاندنی دەوڵەتی لیدیا لە ئەنادۆڵ ساڵی٥٤٦پ.ز، و داگیر کردنی ئەفغانستان و هەردوو هەرێمی (سەیحوون وجەیحون) و قەندەهار و تا باکووری خۆرئاوای هیندستان، پاش ئەم جەنگانە کۆرش ڕووی کردە ولاتی بابل و توانی پادشای بابلیەکان بشکێنێ و بابل داگیر بکات، ساڵی ٥٣٩پ.ز نازناوی پاشای بابلی لەخۆنا.

## قەمبیز (کەمبوجیە) ٥٣٠ - ٥٢٢پ.ز:

قەمبیزی دووەم سەرکردەیەکی گەورەی هەخامەنشیەکان بوو سەرەڕای چەسپاندنی دەسەلاَتی بەسەر ئەو زەوی و زارانەی لە سەردەمی کورشی باوکی داگیر کرابوو، هەڵمەتی بردە سەر ولاَتی میسر، ساڵی ٥٢٥پ.ز توانی داگیری بکات.

ساڵی ٥٢٢پ.ز لە ولاَتی فارس (باردیا) ی برای قەمبیز شۆڕشی بەرپاکردو قەمبیز ناچار میسری بەجێ هێشت و بەرەو ولاَتی فارس گەڕایەوە، بەلاَم لەپیلانێکدا دارای یەکەم(داریوشی یەکەم) توانی قەمبیز لەناوبەرێت و فەرمانڕەوایی باردیاش زۆری نەخایاند.

## دارای یەکەم (داریوشی یەکەم) ٥٢٢ - ٤٨٦پ.ز:

سەرەتای حوکمی دارای یەکەم(داریوشی یەکەم) بەهەڵگەڕانەوە و شۆڕشی ویلایەتەکان دەستی پێکرد بەتایبەتی شۆڕشی میدیا و عیلام و بابل، دارا هێرشی بۆ سەر بابل دەست پێکردو توانی داگیری بکاتەوە و دەستی بەسەردا بگرێتەوە و پاشان شۆڕشەکانی تری میدیاو عیلام و ناوچەکانی تری دامرکاندەوە، دارا ئەم سەرکەوتنانەی لەسەر کێوی بێستون هەڵکەندووە کە دەکەوێتە نزیک شاری کرماشان لە ڕۆژهەلاَتی کوردستان. شایانی باسەشۆڕشەکەی میدیا (کوردستان) بەسەرکردایەتی فراورتس بوو.



وێنەی ژمارە (٢٤) فراورتس سەرکردەی شۆرشی میدییەکان
(لە کێوی بێستوون وەرگیراوە)

دارای یەکەم (داریوشی یەکەم) لە ماوەی ٥١٨ ــ ٥١٤پ.ز توانی چەند ڕێکخستنێکی کارگێڕی پەیڕەو بکات، وڵاتەکەی دابەش کرد بەسەر (٢٦) ویلایەتدا (هەرێمدا) کە پێیان دەووترا (ساتراب) هەروەها دەزگای تایبەتی ئاسایشی دامەزراند بۆ پاراستنی وڵات وەدانانی سیستەمێك بۆ وەرگرتنی باج و ڕێکخستنی ڕێگا و بانە بازرگانیەکان، وە لە ڕووی ئایینیەوە ڕێزی لە خواوەند (ئاهورامزدە) دەگرت کەوای دەزانی سەرکەوتنەکانی لە ڕێگەی ئەم خواوەندەوە بووە لەمەوە دەردەکەوێت دارا پەیڕەوی ئاییني زەردەشتی کردووە.



وێنەی ژمارە (٢٥) تاقی بوستان (کێوی بێستون)

سەرکەوتنی داریوش بەسەر دوژمنەکانی

## شەڕەکانی یۆنانی- ئەخمینی (٤٩٠ – ٤٨٠ پ . ز):

هۆکارەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ داگیرکردنـی ولاّتـی یۆنـان لـە لایـەن ئەخمینیەکان (هەخامەنشیەکان)ەوە و ڕاپەڕینی یۆنانیـەکان دەسـتی پێکـرد بەتایبەتی شاری (ئەسینا) کە پەیڕەوی ڕاپەڕینەکەی دەکرد. ئەوە بوو چەند شـەڕێکی گـەورە لـە نێـوان هـەردوولادا بـەرپابوو، بـەناوبانگترینیان شـەڕی دەشـتی (مـاراثـۆن) بووسـاڵی ٤٨٦ پ.ز کـە بەسـەرکەوتنی یۆنانیـەکان و شکستی هەخامەنشیەکان کۆتایی هات.

## پاشا ئەحشویرشی یەکەم٤٨٦ ـــ ٤٦٥پ.ز:

ئەم شایە ئەرکێکی گەورەی کەوتە ئەستۆ ئـەویش بـەرەنگار بوونـەوەی شۆڕشـی ویلایەتـەکان بـوو. یەکـەم جـار تـوانی شۆڕشـی میـسریەکان دابمرکێنێتەوە سـاڵی ٤٨٤ – ٤٨٢ پ.ز بـە توندی لـە شۆڕشـی دانیـشتوانی بـابلی دا وشـارەکەی کـاول کـرد و زەقـوڕە بەناوبانگەکـەی وێـران کـرد.

---

لە سەردەمی دارای یەکەمدا.

ئەحشویرشی یەکەم خۆی کۆکردەوە بۆ جەنگی یۆنانیەکان بەلاَم لەم هەڵمەتەیدا شکستی هێنا بەتایبەتی لەشەڕی (بلاتیە) دا.

## پاشا ئەرتحشتای دووەم ٤٠٤ ـ ٣٥٩ پ.ز:

ئەرتحششتای دووەم لەو ڕۆژەوەی کە دەسەلاَتی لەپەرستگای شاری (بازرگادە) وەرگرت لەلایەن برا بچووکەکەیەوە کەناوی کۆرش بوو هێرشی کرایە سەر بەلاَم هێرشەکە شکستی هێنا، لەگەڵ ئەوەی بڕیاری لێ خۆش بوونی بۆ دەرکرد بەلاَم ئەو سور بوو لەسەر دژایەتیەکەیەوە ئەوە بوو کۆرش جاڕی شۆرشی بە یارمەتی گریگەکان (یۆنانیەکان) دا کە بەهەڵمەتی دەهەزار سواری یۆنانی ناسراوە بەسەرۆکایەتی (زەینەفۆن). ئەرتحششتا توانی بەسەر ئەم شۆڕشەدا سەربکەوێت و کۆرشی برای بکوژێت.

بەم جۆرە لەشکرەکەی زەینەفون دوای تەواو بوونی کارەکەیان ساڵی ٤٠١ ـ ٤٠٠پ.ز بە کوردستاندا گەڕانەوە بۆ یۆنان،لە ڕێگادا تووشی بەرگری و هەڵمەتی کوردان بوونەوە( کە زەینەفون بە کاردۆخی ناوی بردوون لە کتێبەکەی ئەناباسیس).

شایانی باسیشە دواپادشای هەخامەنشیەکان داریوشی سێیەم بوو کە ساڵی ٣٣١پ.ز لە شەڕی گۆگمێلا (ئەربێلا) نزیك هەولێری ئێستا لە بەرامبەر لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی شکا، بەم جۆرە دەوڵەتی هەخامەنشی ڕووخا و تەواوی ئەنادۆل وشام و میسر و کورستان و عێراق و ئێران بوونە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنی، هەرچەندەناوچەی میدیا (کورستان) دوای شکانی داریوش سەربەخۆیی خۆی بۆ ماوەیەك لە ژێر سەرکردایەت (ئەتروبات = ئەتروباتکان) ڕاگەیاند. ساڵی ٣٢٣پ.ز ئەسکەندەر لە شاری بابل دەمرێ و ئەنجامەکەی ئەوەبوو ئیمپراتۆریەتەکەی ئەسکەندەر

لـە نێـوان سـەرکردە سـەربازیەکانی خـۆی دابەشـکراو، ئـەنادۆڵ وشـام و کوردسـتان وعێـراق وئێـران بـەر (سـلۆقس) کـەوتن وئـیتر ئـەم سـەردەمە بەسەردەمی (سلۆقی) ناودەبرێت، میسریش بـەر (بـەتلیمۆس) کـەوت و ئـیتر ئەم سەردەمە بە سەردەمی (بەتاڵیسە) ناودەبرێت.

## راهێنان

١- فارسەکانی کە لە ناوچەی (پارس)دا جێ نشین بـوون, ماوەیـەکی زۆر مل کەچی:

گریکەکان , میدیەکان , حیثیەکان : بوون

٢- لە مێژووی دێرین ((شـەڕ)) کردنـی سـیمای سـەرۆکی پەیوەنـدی نێـو دەوڵەتی بوو....

ئایا ئێستا سیمای سەرۆکی سەرەکی ئەم پەیوەندیە نێو دەوڵتیە چییە؟

تەوەرێك بۆ گفتوگۆ.

# بەشی دووەم

## ئێران لەسەردەمی فورثیەکان ( ئەشکانیەکان )

لە دەوروبەری ساڵی ٢٥٠ ـ ٢٤٧پ.ز دا و لـەنێوان ئـەو هۆزانـەی کـە لـە وڵاتـی (بـارثـوا) (خوراسان)ی ئێستا نیـشتەجێ بوون، دووبرای سەرکردە دەرکەوتن بـەناوی (تیریداتس) و (ئەرشاك) کـە توانیـان لەشـەڕێکی خوێناویدا کـە (ئەرشـاك)ی تێدا کوژرا سەرکەوتن بەدەست بێنن دژی (سلۆقیەکان) لە هەرێمی (پارثـوا)، پاشای ئەشکانیەکان توانی هەرێمی خۆراسان و چەند هەرێمێکی دەوروبـەری دەریاچــەی قــەزوین داگیربکـات، لەبــەرفراوان و گــەورەیی ئیمپراتۆریــەتی ئەشــکانی دوو پایتــەختیان بۆخۆیــان دروســتکرد یەکــەمیان (ئــەکباتانا) (هەمەدان)ی میدیەکان بوو کە پایتەختی هاوینەیان بـوو، دووەمیان (تەیسەفون) لەســەر بەشی خۆرهەڵاتی ڕوباری دیجلە، پایتەختی زستانەیان بوو.

### پاشا متریداتس یەکەم ١٦٠ - ١٤٠پ.ز:

دەوڵەتی ئەشکانیەکان لە سەردەمی پاشا متریداتس دا زیاتر دەســەڵاتی جێگیر بوو، بەشێوەیەك وڵاتی میدیا و فارس و بابل و هــەرێمی ئارامیــەکان و ئاشـوریەکانی گرتــەوە، ئەشـکانیەکان لـەم سـەردەمەدا شـاری (تەیـسەفون) (تاقی کیسرا= سەلمان پاکی ئیستای نزیك شاری بەغداد) یان دروسـت کـرد، قریداتــسی یەکــەم کــە بــە دامەزرێنــەری ئیمراتۆریــەتی ئەشـکانی دادەنرێـت نازناوی (پاشای پاشایان)ی بۆ خۆی هەڵبژارد، و نازنـاوی (هیلینــەکان)یـشی لە خۆ نا بۆ ڕازی کردنی یۆنانیەکان.

## شەڕی نێوان سلوقیەکان و ئەشکانیەکان:

سـلوقیەکان هەمیـشە لەهـەوڵی ڕزگاربوونـدا بـوون لـەژێر دەسـەڵاتی ئەشکانیەکان، ئـەوە بـوو لەسـەردەمی پاشـای سلوقیەکان (ئـەنطیـوخسی حەوتـەم) دا هەڵمـەتێکیان ئامـادەکرد بـۆ سـەر هەرێمـەکانی خۆرهـەڵات و توانیان لەسێ شەڕدا بەسەر ئەشکانیەکاندا سەربکەون و شـاری (ئـەکباتانا) داگیر بکەن.

## فراهاطس:

کاتێك فراهـاطس هاتـە سـەر تـەختی پادشـایی ئەشـکانیەکان، داوای لـە سلوقیەکان کرد پەیمانی ئاشتی ببەستن، بەڵام سـلوقیەکان قبوڵیـان نـەکرد، لەبەر ئەوە فراهاطس هانی دانیشتوانی شارەکانی دا دژی سلوقیەکان شۆرش بکەن، خۆشی بەسوپایەکی بەهێزەوە هێرشی کردە سەر ناوەندی دەسەڵاتی (ئـەنطیـوخـس) و تـوانی لـەو شـەڕەدا بیکوژێـت و ژمارەیـەکی زۆری سـەربازەکانی بـەدیل بگرێـت. بەمـەش سـاڵی ١٢٩پ.ز سـلوقیەکان کەوتنـە مەترسی لەناوچوون لەخۆرهەڵاتەوە مەترسی ئەشـکانیەکان و لـە خۆرئـاواوە ڕۆمانیەکان.

## متریداتس دووەم ١٢٣ - ٨٨پ.ز:

دەوڵـەتی ئەشـکانی لـە بەشـەکانی خۆرهەڵاتـدا ڕووبـەڕووی هێرشـی هۆزەکانی (سـاکا) بوونـەوە، ئـەم هـۆزە کۆچـەرانە ڕژانـە وڵاتـی ئێـران و لـە زنجیرەشەڕێکدا ئەشکانیەکانیان شکاند و شا (فراهاطس) یان کوشت.

ساڵی ١٢٣پ.ز پاشایەکی بەهێز سەری هەڵدا بـەناوی متریـداتس دووەم کە سـەلماندی فەرماندەیـەکی بـەهێز و مەزنـە، تـوانی هـەموو مەترسـیەکانی

هۆزەكانی (ساكا) نەهێڵێت و هەموو ویلایەتـەكان بگێڕێتـەوە ژێـر دەسـەڵاتی خۆی، پاش ئەوە خۆی تەرخان كرد بۆ كـاری ئاشـتی و پەیوەنـدی بازرگـانی لەگەڵ چینیەكان.

## شەڕەكانی نێوان ئەشكانیەكان و ڕۆمانیەكان

**یەكەم:**

كۆنترین پـەیوەندی نێـوان ئەشـكانیەكان و ڕۆمانیـەكان دەگەڕێتـەوە بـۆ سەردەمی مترێداتس دووەم، كە ساڵی۹۲پ.ز داوای پـەیمان بەسـتنی ئاشـتی لەگەڵـدا كـردن، بـەڵام ڕۆمانیـەكان ڕازی نـەبوون و بەسـەركردایەتی (سـلا) هێرشیان كردە سەر مەملەكەتی ئەرمەن، مترێداتس وەفدێكی نارد بۆ گفـت و گۆی ئاشتی بەڵام (سـلا) بـەوەڕازی نـەبوو، لەبـەر ئـەوە جـەنگ لەنێوانیانـدا بەرپابوو، لەزنجیرەیـەك شـەڕ و پێكدادانـدا ڕۆمانـەكان شـكان و ناچـار داوای پەیمانی ئاشتیان كرد لەسەردەمی فراهاطسی سێیەم ساڵی ٧٦ ــ ٧٠پ.ز .

**دووەم:**

پاش كوشتنی فراهاطـسی سـێیەم ئـاژاوە بـاڵی كێـشا بەسـەر دەوڵـەتی ئەشـكانیەكاندا بەتایبـەتی لـە نێـوان بنەماڵـەی فـەرمانڕەوادا، ڕۆمانیـەكان بەسـەركردایەتی (كراسـوس) ئـەم هەلـەیان قۆسـتەوە جـەنگیان دژی ئەشكانیەكان بەرپاكرد، ئەوە بوو ساڵی ٥٧پ.ز شەڕی خوێناوی (حەران) لـە باكوری ڕۆژئاوای كوردستان ڕوویدا و ڕۆمانیەكان شكان و كراسوسیش كوژرا.

**سێیەم:**

ڕۆمانیـــەکان بەســـەرکردایەتی (کاســـیوس) توانیـــان (تەیـــسەفۆن) ی پایتەختی ئەشـکانیەکان داگیربکـەن، هـەروەها هێرشـیان بـردە سـەر شـاری (الحضر) و داگیریان کرد. دژوارترین سـەردەمی نەهامـەتی ئەشـکانیەکان لـە سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانی ( کـراکلا) دا بـوو، ئـەم سـەرکردەیە بـەفێڵ وا خـۆی پیـشان دا دەیـەوێت پـەیمانی ئاشـتی لەگەڵیانـدا مـۆر بکـات بۆیـە دانیشتوانی (طیـسفون) دەرگاکـانی شـاریان خـستە سەرپـشت و دڵنیـابوون، بەڵام کراکلا دڕندانـە هێرشـی بردنـە سـەریان و ژمارەیـەکی بـێ شـوماری لـە خەڵکی کوشت. بەڵام ئەویش بە سزای خۆی گەیشت و بەنهێنی تیرۆر کرا.

**چوارەم:**

دوا شەڕی نێوان ڕومانیەکان و ئەشەکانیەکان شەڕی (نوصەیبین) بوو لە باکوری ڕۆژئاوای کوردستان کـە ئەنجامەکـەی بـەمۆرکردنی پـەیمانی ئاشـتی کۆتای هات، بەو جـۆرە جـەنگی نێـوان هـەردوو لا کـە نزیکـەی دوو سـەدەی خایاند جگە لەکاول کاری و وێران کردن هیچ لایەکیان سەرکەوتوو نەبوون.

## کۆتـایی دەسەڵاتی ئەشکانیەکان:

جـەنگی دوور و درێـژی دووسـەدەی نێـوان ڕۆمانیـەکان و ئەشـکانیەکان هـۆی سـەرەکی لاوازی دەوڵـەتی ئەشـکانیەکان بـوو، بـەڵام هەڵگەڕانـەوە و شۆڕشی ویلایەت و میرنـشینەکانیش زۆر کاریگـەربوون، بەتایبـەتی شۆڕشـی هەرێمی فارس بەسەرکردایەتی ئەردەشـێری کـوڕی بابـك کـوڕی ساسـان کـە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و دەوڵەتی ساسانی دابمەزرێنێت.

# بەشی سێیەم

# ئێران لە سەردەمی ساسانیەکان

ساسانیەکان بەناوی (ساسـان)ی باپیری (ئەردەشـێر)ەوە نـاونراون کـە پیـاوێکی زانـا و ئـاییینی بـووە لەشـاری (ئەسـتەخر) ی هـەرێمی فـارس. ئەردەشێر پاش مردنی (بابك)ی باوکی دەسـەلاتی گرتۆتـە دەسـت، جـەنگی کۆتایی نێوان پاشای ئەشکانیەکان و ئەردەشـێردا بەسـەرکەوتنی ئەردەشـێر کۆتایی هات.

لە ساڵی ٢٢٤ زایینی دا(مەدائن) (تەیسەفون)ی پایتەختی داگیرکرد و لەوێ خـۆی بەمیراتگـەری ئەشـکانیەکان لەقەڵـەم دا و فـەرمانڕەوایی بنەماڵەیـەکی نـوێی بـەناوی ساسـانیەکانەوە ئاشـکراکرد و نازنـاوی (شاهەنـشا) ی لـەخۆنا. ئەردەشـێر لەزنجیرەیـەك شـەڕ و پێکدادانـدا فەرمانڕەوایيەکـەی چەسـپاند و توانی هەرێمەکانی میدیا و ئەرمینیا و ئەفغانستان وبلوخستان و بابل داگیر بکات.

## شاپووری یەکەم ٢٤٢ - ٢٧٢ز:

کاتێك شاپوور هاتە سـەر حـوکم تووشـی شورشـی ئـەرمینیا و(الحـضر) بۆوە، شاپوور توانی پاش چوار ساڵ بەسەر ئـەم شۆڕشـانە دا سـەربکەوێت. گەورەترین مەترسی کە شـاپوور بـیری لێـدەکردەوە، مەترسـی بیزەنتیـەکان بوو.

شاپور پاش ئەوەی بارودۆخی ولاتەکەی جێگیر بوو، سوپایەکی بەهێزی ئامـادەکرد دژی بێزەنتیـەکان و بـەرەو سـوریا ڕەوانـەی کـرد و زۆریـەی شـارەکانی داگیرکـرد تـا گەیشتە (ئـەنتاکیا)، بیزەنتیـەکان ناچـار پـەیمانی

ئاشتیان بەمەرجەکانی شاپوور مۆرکرد، پاش چەند ساڵێك جەنگێکی نویٚ لەنێوانیاندا ڕووی داو بیزەنتیەکان دیسان تیایدا شکان وحەفتا هەزار دیلیان لیٚ گیرا، کە ڕەوانەی شاری شاپوور کران و لەویٚ بەنداوێکی گەورەیان پیٚ دروست کردن بە ناوی بەنداوی ئیمپراتۆر لە سەر ڕووباری کارۆن.

## شاپووری دووەم ٣١٠ - ٣٧٩ز:

شاپووری دووەم زۆرترین ماوەی فەرمانڕەوایی گرتۆتە دەست کە نزیکەی حەفتا ساڵی خایاندووە، ئەم شایە لەو ماوە دوور و درێژەدا گەلێك کردەوەی گرنگی بەدەست هێنا:

### یەکەم: کارەکانی لەناوەوەی وڵات:

١- کەمکردنەوەی دەسەڵاتی خانەوادەکان، کە ئەمانە دەسەڵاتی زۆریان هەبووەو سامانێکی زۆریان پەیداکردووە، شاپوور دەسەڵاتی خانەدانەکانی کەم کردەوە و بەهیچ جۆرێك ڕێی پێنەدان دەست لە کاروباری دەوڵەت وەربدەن.

٢- ڕێکخستنەوەی کاروباری کارگێڕی و ئابووری.

### دووەم: کارەکانی دەرەوە:

١- شەڕەکانی لەگەڵ هۆزەکانی (هۆن) لەوڵاتی چین وکەدواتر پەیمانی ئاشتی لەگەڵدا بەستن و زۆربەیان هاتنە ژێر ڕکێفیەوە.

٢- ساڵی ٣٥٩ز توانی هێرش بەرێتە سەر قەڵای (ئامەد= دیاربەکر) و لە دەستی بێزەنتیەکانی ڕزگاربکات.

٣- عەرەبەکانی هەرێمی (بەحرەین)ی شکاند.

٤- دوا جـەنگی شـاپوور لەگـەڵ بیزەنتیەکانـدا پـاش بڵاوبوونـەوەی ئـایینی مەسیحی بـوو، کەئـەم ئایینـەبوو بـەئایینی ڕەسمـی بیزەنتیـەکان شـەڕو جەنگی نێوانیان بێ ئەنجام بەپەیمانی ئاشتی کۆتایی هات.

## کیسرا ئەنو شیروان

سەردەمی کیسرای یەکەم کە بە ناوی ئەنوشیروان ناسراوە بەگەشترین سەردەمەکانی دەوڵەتی ساسانی دادەنرێت. کیسرا ئەنوشـیروان لـە مـاوەی دەسـەڵاتیدا تـوانی خزمـەتێکی گـەورە بگەیەنێتـە گـەلی ئێـران لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانـدا، ئەمـە جگـە لـەوەی کەسـەڵاتی ساسـانیەکانی گەیانـدە (یەمەن) لە ڕێگای دەریاوە.

## چاکسازیەکانی کیسرا ئەنوشیروان

**١- لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە:**

میری ویلایەتەکانی ئاگادار کردەوە کە هیچ کارێك بـەبێ پرسـی مەرکـەز ناکرێـت واتـە مەرکەزیـەتی پـەیڕەو کـرد، دوای پـشێوی کۆمەڵایـەتی چارەسەرکرد کە پـشتگیرانی (مـەزدەك) دروسـتیان کردبـوو، مـاڵ و زەوی و زاری گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانی، و تاوان بارانی بە سزای خۆیان گەیاند.

**٢- لەبواری ئابووریدا:**

لەم بوارەدا کیسرا فەرمانی دا بەنوێ کردنەوەو ئاوەدان کردنـەوەی ئـەو گوند و ڕێگا و پرد و جۆگایانەی کە خاوەنەکانیان نەیان توانیبـوو پارێزگـاری بکەن بەهۆی ئەو پەشێویەی لایـەنگیرانی (مـەزدەك) نابوویانـەوە، هـەروەها یاسای باجی سەرلەنوێ بەشێوەی گونجاو دانایەوە.

لە گرنگترین شوێنەوارەکانیشی (تاقی کیسرا) لە (مـەدائین) کەتائێستا لـە خوار بەغدای ئەمڕۆ ماوە.



وێنەی ژمارە (٢٦) تاقی کیسرا لە مەدائین

## هۆکارەکانی ڕووخاندنی دەوڵەتی ساسانی :

١- ململانێی نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەواکان و نەمانی شکومەندی پاشاکان.

٢- ململانێی نێوان ئایینەکان بەتایبەتی نێوان ئایینی زەردەشتی کە ئایینی فەرمی دەوڵەت بوو لەگەڵ ئایینەکانی تری وەک جولەکەو مەسیحی لەلایەکەوە، مەزدەکی و مانەوەی لەلایەکی ترەوە .

٣- دەسەڵاتی نەجیب زادەو دەرەبەگەکان کە پەیڕەوی مەرکەزیان نەدەکرد.

٤- زۆری باج لەسەر دانیشتوان بەتایبەتی دوای سەردەمی (ئەنوشیروان) بوو بەهۆی ناڕەزایی زۆر لەنێوان چینە جیا جیاکاندا.

٥- زنجیرە جەنگەکانیان لەگەڵ زۆربەی نەتەوەکانی دراوسێ وەك بیزەنتیەکان و ئەرمەنیەکان و تورك و عەرەب.

# بەندی پێنجەم

## مێژووی کۆنی دۆڵی نیل ( میسر )

وڵاتی میسر دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی کیشوەری ئەفریقا، بەسەر دوو دەریای گرنگدا دەڕوانێت یەکەمیان دەریای سپی ناوەڕاست (ڕۆم) لەباکوورەو ئەوی دیکەیان دەریای سور (قەڵزەم) لە خۆرهەڵاتەوە، بەشی باشووری میسر بریتی یە لەوڵاتی سۆدان لە رۆژئاواش وڵاتی لیبیایە و بەم شێوەیەش هەرسێ کیشوەری جیهان (ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپا) بەیەک دەگەیەنێت و هەر لە سەردەمانی کۆنەوە ڕێگای سەرەکی ئەم بەیەک گەیاندنە بووە. پاش تێپەڕبوونی ڕووباری نیل بە وڵاتی میسر دا گرنگیەکی تری بەم وڵاتە بەخشیوە، هەروەک گەورە مێژوونووسێکی وەک هێرۆدۆتس دەڵێت: (میسر خواپێداوی نیلە).

## چاخەکانی پێش مێژوو:

چاخەکانی پێش مێژوو بەشی زۆری مێژووی مرۆڤایەتی پێکدەهێنن لەسەر ڕووی زەویدا، لە میسریش بەهاوشێوەی وڵاتانی دیکە لەگەڵ پەیدابوونی یەکەم مرۆڤ لە ناوچەکەدا دەستپێدەکات کە بۆ هەزاران ساڵ بەر لە زاین دەگەڕێتەوە تا کاتی داهێنانی نووسینی هێرۆگلیفی لە(٣١٠٠پ.ز)، بەڵام سەبارەت بەو ماوەیە زانیاری کەمە بۆیە بۆ دەسکەوتنی زانیاری، پشت بەشوێنەوارو کەل و پەل و پاشماوەکان دەبەسترێت، لەمانەش بەتایبەتی گڵێنەسازی، مرۆڤ لەم سەردەمدا ژیانێکی سادەو ساکار ژیاوە بەردی بۆ کەل و پەلەکانی ژیانی ڕۆژانەی بەکارهێناوەو لەکۆتایی سەردەمەکانی تردا بەکارهێناوە.

به شێوەیەکی گشتی چاخەکانی پێش مێژوو دابەش دەکرێن بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە:

**یەکەم:** چاخی بەردینی کۆن (تا دەوروبەری نزیکەی٨٠٠٠پ.ز دەگرێتەوە):

لەم چاخەدا سەرجەم پێداویستیەکانی ژیانیان لەبەرد دروست کردووە، بۆیە پێی دەگوترێت چاخی بەردین، ئەمە جگە لەبەکارهێنانی دار و ئێسکی ئاژەڵ.

## * گرنگترین خاسیەتەکانی ئەم سەردمە:

١- سەرجەم پێداویستیەکانیان لەبەرد دروست کردووە وەك: چەقۆ، تیر، ......هتد

٢- کۆڵەکەی سەرەکی ژیانیان بریتی بووە لە ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی و کۆکردەنەوەی خۆراك.

٣- شوێنێکی تایبەت و دیاری کراویان نەبووە بۆ نیشتەجێ بوون.




شێوەی (٢٧) نەخشەی

دۆڵی نیل (میسر)

**دووەم:** چاخی بەردینی ناوەڕاست:

سەبارەت بەم چاخە لەمیسر شوێنەوار زۆر کەمەو زانیاریش لەبارەیەوە کەمە تەنها لەناوچەی (حەلوان) نزیك بەقاهیرە نەبێت کە چەند شوێنەوارێکی کەمی تیادا دۆزراوەتەوە، لەم سەردەمەدا ئەو کەلوپەلانەی, کە لە بەرد دروستدەکران لەڕووی قەبارەوە گەورە بوون.

**سێیەم:** سەردەمی بەردینی نویێ:

لە سەردەمی بەردینی نوێدا کۆمەڵێك گۆڕانکاری ڕوویداوە، کە لە سەردەمەکانی تری پێش خۆیدا نەبووە، هەر بۆیە ئەم سەردەمە بەسەردەمێکی گرنگ دادەنرێت، ئەمەش بەهۆی دۆزینەوەی کشتوکاڵ لەم سەردەمەدا و هەروەها فێربوونی بەخێو کردنی ئاژەڵ وماڵیکردنیان و درووستکردنی خانوو بەرەو نیشتەجێبوون و گڵێنە سازی و دروستکردنی جل و بەرگ و هەڵگرتنی چەك بۆ خۆپاراستن لە سیما دیارەکانی ئەم سەردەمەن.

**چوارەم:** چاخی بەردینی کانزایی:(٣٨٠٠ ــ ٣٢٠٠پ.ز):

ئەم سەردەمە لەهەموو چاخەکانی پێش خۆی پێشکەوتووتربووە کەپێی دەگوترێت سەردەمی پێش شارستانیەت یاخود سەردەمی سەرەتای شارستانیەت، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی کانزا لەکەل و پەل و پێداویستیەکاندا لە جیاتی بەرد لەژیانی ڕۆژانەدا.

*** گرنگترین خاسیەتەکانی ئەم سەردەمەش بریتی بوون لە:**

١- بەکارهێنانی کانزای(مس و برۆنز).

٢- بەکارهێنانی بەرد لەبواری جوانکاریدا وەك ملوانکەو بازن و ...هتد.

٣- فراوان بوونی بواری کشتوکاڵ.

٤- فراوان بوونی قەبارەی لادێکان و ڕێکخستنیان بەشێوەیەکی ڕێك وپێك.

٥- پێـشکەوتنی گڵێنەسـازی بەتایبـەتی گڵێنـەی ڕەنگـاو ڕەنـگ، کـە بەشێوازێکی هونەری جوان دروست کرابوون.
٦- لەکۆتایی ئەم سەردەمەدا پەیوەندی لەگەڵ دەرەوە پەیدابووە.

## چاخە مێژووییەکان:

پێش دروستبوونی دەسەڵاتی سیاسی بنەماڵەکان وڵاتی میسر بە چەند یەکەیەکی سەربەخۆ یان دەوڵەتۆیەکی بچووک بچووکدا دابەش بوو بوو چ لە باکوور و چ لەباشوور...، هەریەکە لەم دەوڵەتۆکانەش فەرمانڕەواو خواوەندی تایبەتمەندی خۆیان هەبووە، تا لە سەردەمی شا (مینا) دا توانی دەوڵەتێکی یەکگرتوو دابمەزرێنێت، کە پایتەختی شاری (مەنفیس) بێت و تیایدا نزیکەیی (٣١) بنەماڵە فەرمانڕەوایەتی بکات.

## مێژووی چاخە کۆنەکان لەمیسر دابەش دەکرێت بۆ چەند سەردەمێك ئەوانیش:

### یەکەم: سەردەمی کۆن:

ئـەم سـەردەمەش بـەپێی مـاوە مێژووییـەکان دابەشـدەکرێت بـۆ چـەند سەردەمێکی دیکـە لەوانـە سـەردەمی سـەرەتای دەسـەڵاتی بنەماڵـەکان کـە بنەماڵـەی یەکـەم و دووەم دەگرێتـەوە و لـە سـاڵی(٣١٠٠پ.ز) بەفـەرمان ڕەوایەتی مەلیك (مینا) دەستپێدەکات و شاری(مەنفیس) دەکەنـە پایتـەختی

خۆیان، کەلە هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بـەم شـارەوتراوە (تـرازووی زەوی)، ئەمەش لەبەر ئـەوەی کـە ئەگـەر بـارودۆخ لـەوێ نائـارام بوایـە ئـەوا ئەبووە نائارامی و پشێوی لەناوچەکانی دیکەشدا، پادشا و مەلیکـەکانی ئـەم چـاخەش چـەندین نـاو و ناسـناویان لـەخۆیان نـاوە وەك (شـای میـسری سەروخوار) یان (باکوور و باشوور).

پاش ئەمان سەردەمی هەرەمەکان دێت کە بنەماڵەی سێیەم تا شەشـەم دەگرێتەوە، پادشاکانی ئەم سەردەمە چەندین هەرەمی گەورەو بەناوبانگیان درووسـتکردووە، وەك یەکـەم هـەرەم، کـە لـە لایـەن (زۆسـەر) لەناوچـەی (صەقارە) بەشێوەی پلیکەدار درووستکراوە کە لە (٦) چین پێکهاتووە.



وێنەی ژمارە (٢٨) هەڕەمی پلیکەدار (چین چین)

هـەروەها لەسـەردەمی بنەماڵـەی چـوارەم لەلایـەن مـەلیك (خۆفـۆ) وە پایتەختی گواستەوە بۆ ناوچەی (جیزە) و لەوێ هەرەمێکی تیادا دروستکرد، کە تەلارێکی بەردینی گەورەیەو بناغەیەکی چوارگۆشـەیی هەیـەو شـێوەکەی هەرەمییـە و لاکـانی سێگۆشـەیین، ئـەو تاشـەبەردانەی هەرەمەکـەی لـێ درووستکراوە بەشێوەی چوارگۆشـەیی داتاشـراوەو کێشی هـەر بـەردێك دوو تەن و نیو دەبێت و درێـژی بناغـەی چوارگۆشـەکەی نزیکـەی (٧٥٥) پێیـەو

بەرزیەکەی (١٣٩ ــ١٤٠) مەترە، نزیکەی دووملیۆن و سێسەد هەزار بەردی تیادا بەکارهێنراوە و ماوەی (٢٠)ساڵی خایاندووە و ڕۆژانە (١٠٠) هەزار کرێکار کاریان تیادا کردووە، لەگەڵ ئەم هەرەمەدا ژمارەیەك ژوور لە دەوروبەری هەرەمەکەدا هەیە، کەئەمانەش تایبەت بوون بە پیاوانی ئایینی و قوربانی کردن و.......هتد.

هەروەها مەلیك (خەفرەع)، کە نازناوی (فیرعەون)ی لێنراوە، بەواتای (ماڵی گەورە یان مەزن)ە، ئەم مەلیکەش بەهاوشێوەی باوکی لە (جیزە) هەرەمێکی درووستکرد و لەگەڵیشیدا پەیکەرێکی درووست کرد، کە بە (ئەبوئەلهول) لەئێستادا ناسراوە ئەم پەیکەرە بریتیە لەسەری مرۆڤێك کە بە لاشەی شێرێکەوەیە، کەئەمەش مەلیك (خەفرەع) دەنوێنێت،



وێنەی ژمارە (٢٩)

لەگەڵ ئەمانەشدا پەرستگایەکی گەورەی دروست کردووە کە بە (معبدالوادي) دەناسرێت، سێیەم هەرەمی مەزنیش هەرەمەکەی مەلیك (مەنکورەع) بوو لەتەك دوو هەرەمەکەی تر، هەروەها هەر لەم سەردەمەداچەند هەرەمێکی بچووکتر درووستکراون وەك (صەقارە و ئەبوصیر و ...هتد). لە لایەنی بیروباوەڕیشەوە لەم سەردەمەدا وازیان لەپەرستنی فیرعەون هێناوە و پەرستنی خواوەند (ڕەع) دەستپێدەکات،

بۆیه زیاتر گرنگی بەپەرستگاکان دراوە و سەربارى ئەوەی کە درووستکردنی هەرەمەکان لەم قۆناغە مێژووییەدا بەواتاى پێشکەوتنی هونەرى تەلار سازى و بەرزی ئاستی گوزەران و هێمنی و ئاسایش دەگەیەنێت.



وێنەی ژمارە (٣٠)

سێ هەرەمە گەورەکەی فیرعەون

خوفو، خەفرع، مەنکورەع

## هۆکارەکانی درووستکردنی هەرەمەکان:

١- هۆکارە ئایینیە، کە میسرییە کۆنەکان باوەڕیان بەزیندووبوونەوەی پاش مردن بووە، وایان داناوە کە مرۆڤ لەدووبەش پێکهاتووە (جەستەو گیان)، گیان کاتێك لەجەستە دەردەچێت جارێکی تر بۆی دەگێڕێتەوەو زیندوو دەبێتەوە و دەچێتە ئاسمان، بۆیە پێویستە شوێنێك هەبێت بۆ پاراستنی جەستە لەتێکچوون و خراپبوون.

٢- میسرییە کۆنەکان چەندین خواوەندیان پەرستووە، لەوانە خواوەندی ڕۆژ، کە پێیان وابووە زەوی و ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە، بۆیە چەندین پەیکەریان بۆ درووستکردبوو، هەروەها ڕەمزێکیان بۆ دانابوو، کەئەویش (ڕەع) بوو، خواوەندی دووەم (نیل) بوو، باوەڕیان وابوو, کەژیان لەسەرزەوی درووست دەکات یاخود ئەژێنێتەوە، بۆیە هەرەمیان بۆ دروست کردبوو...

٣- هەروەها بوونی بەرد لە ناوچەی (صوان) لەباشووری میسر و لەناوچەی (جبل المقطم) لە ڕۆژهەلاتی بیابانی (سینا) یارمەتیدەرێکی باش بووە بۆ درووستبوونی هەرەمەکان.

٤- هەروەها بۆ پاراستنی سنووری ولاتەکەیان هەم لەداگیرکردن و هەم بۆ فراوانکردنی سنووری بنەماڵەکەیان لەلایەکی ترەوە.

٥- پێشکەوتنی بواری تەلارسازی ز پەیکەرتاشی لەو سەردەمەدا وەك دەرکەوتنی کەسێکی شارەزاو لێزانی وەك (ئەمنۆحوتب)، کە بەئەندازیاری بواری تەلارسازی دادەنرێت.

٦- دەرکەوتنی یەکەم فیرعەونی بەهێز بەناوی (زۆسەر) لەوسەردەمەدا کە خەڵکی زۆریان خۆش دەویست و هەوڵیان دا، کە هەرەمی بۆ دروست بکەن و لێرەوە هەرەم درووستکردن ببێتە نەریتێك کە فیرعەونەکانی پاش خۆی پەیڕەوی بکەن.

٧- پەیدابوونی کەل و پەلی کانزایی بەهێزی وا، کەلەبڕینی بەردەکاندا بەکارهێنران.

٨- درووستکردنی ئەم هەڕەمانە پێناسەیەك بوو بۆ نیشاندانی یەکێتی سیاسی ولات.

## سەردەمی گواستنەوە:

سەردەمی پیاو ماقولآن و خانەدان و دەرەبەگەکان (ئاژاوەی یەکەم) لەم سەردەمەدا چوار بنەماڵـە فەرمانڕەوایـەتیان کـردووە ئـەوانیش بنەماڵـەکانی (حەوتەم تا دەیەم)ن گرنگترین خەسڵەتەکانی ئەم سەردەمە بریتین لە:

١- بـەهۆی دەرکەوتـنی ئاژاوەو دوبـەرەکی وولآت تـوشی دواکـەوتن هات لە بوارەکانی کۆمەلآیەتی و ئابووری و رامیاری.

٢- دەســەلآتە فــەرمانڕەواکانی ناوەند زۆر لاوازبــوون ئــەمیش بــەهۆی بــەهێزبوونی فەرمانڕەوای هەرێمەکانەوە.

٣- بوونی شەڕ و ململانێی هەرێمەکان بەمەبەستی فراوانکردنی دەسەلآتیان.

٤- نەمانی چالاکی ئابووری وەك پەیوەندیە ئـابووری و بازرگانیـەکان لەگـەڵ ناوچــەکانی دەوروبــەر.

٥- نەبوونی زانیاری لەبارەی مێژووی ئەو بنەمالآنەوە ئەمەش لەبـەر ئـەوەی بەڵگەنامەکان باسیان ناکەن.

## چاخەکانی ناوەڕاست( هەکسۆسەکان ):

سەردەمی بنەماڵـەکانی (یانزەیـەم و دوانزەیـەم) بەسـەردەمێکی گـرنگ دادەنرێــت لەمێــژووی کــۆنی میــسردا، چــونکە زیندووبوونــەوەی ولآت و گەڕانەوەی هێزو توانای بوو بۆ سەردەمانی پێشووی لەم سەردەمەدا لەشاری (طیبە) بنەماڵەیەکی بەهێزی وادەرکەوتن، کەدەسەلآتیان بەسەر هەرێمەکانی دەوروبەریاندا سەپاند و ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لەیـەکگرتنی ولآتـی میسردا، لـــە ســـەردەمیاندا ولآت لـــەبواری ڕامیـــاری و ئـــابووری و پەیوەندییـــە

بازرگانیەکاندا لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەر بووژانەوەی بەخۆیەوە بینی، لە ناوەوە گرنگی درا بەکاروباری ئیداری و بەڕێوەبردن و لەبواری سەربازیشدا چەندین هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی دەوروبەر وەك (نۆبە) و دواتریش پایتەختەکەیان گواستەوە بۆ شاری (مەنفیس)، گرنگترین پاشماوەکانی سەردەمی ناوەڕاستیش دوو پەرستگایە، یەکەمیان لە (کەرنەك) بۆ خواوەند (ئامون) درووست کراوە و دووەمیشیان لەشاری ( هیلیۆ پۆلیس) بۆ پەرستنی خواوەند (ڕەع).

بەڵام دووبەرەکی نێوان میرانی ئەم بنەماڵەیەو هاتنە سەرکاری چەند شایەکی بێهێزو لاواز، کە نەیاندەتوانی بەڕەنگاری چینی فەرمانڕەوایان و چینی سوپا بکەن، هەروەها مەلیکەکانی ئەم بنەماڵەیە بۆ مانەوەو پاراستنی دەسەڵاتیان پشتیان بە سوپایەکی بەردەوام دەبەست و بەڵام بە پێچەوانەوە ئەم سوپایە، کاتێك کە دەمایەوە وەك جینێك هەمیشە دەبوونە جێگای مەترسی بۆ دەسەڵاتەکە ئەمەش ڕێگایەکی بۆ هەکسۆسەکان خۆشکرد، کە لە دەوروبەری ساڵی١٧٨٥پ.ز دا هێرش بکەنە سەر وڵاتی میسر و داگیری بکەن.

## هەکسۆسەکان:

هەکسۆسەکان چەند کۆمەڵەیەکی تێکەڵاو بوون، کە لە گەلێك ڕەگەز پێکهاتبوون و لەوڵاتی شامدا نیشتەجێ بووبوون بەهۆی لاوازی فەرمانڕەوایەتی لەمیسردا و هەروەها تووشهاتنی ناوچەکانی شام بەوشکە ساڵی لەسەردەمی شانشینی ناوەند دا هێرشیان کردە سەر ناوچەی (دەلتا)

و داگیریانکرد توانیان بۆ ماوەی دوو سەدە فەرمانڕەوایەتی تیادا بکەن و ئەم سەردەمەش بە سەردەمی ئاژاوەی دووەم دادەنرێت و کە تیایدا فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەکانی (سیانزەیەم تا حەڤدەهەم) دەگرێتەوە.

هەکسۆسەکان شاری ئەفاریس (تەنیس) یان دروست کردو کردیانە مەڵبەندی دەسەلأتیان میسریەکان بەردەوام لەگەڵ هەکسۆسەکاندا لەململانێ و کێشمە کێشمدا بوون بۆ رزگاربوون لێیان, بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵیان کەوتنە شەڕەوە کە زیاتر لەماوەی نیو سەدەی خایاند تا ئەو کاتەی لە لایەن فەرمانڕەوایانی میسری سەرووکە لە شاری (طیبە) حوکمیان ئەکرد، توانیان لەسەردەمی مەلیك (ئوحموس) لەساڵی ١٥٨٨پ.ز بەتەواوی کۆتایی بەدەسەلأتیان بهێنن و سەردەمێکی نوێ لە مێژووی کۆنی میسر دەستپێبکات، کە بەسەردەمی شانشینی نوێ یان ئیمپراتۆریەت ناسراوە.

## سەردەمی شانشینی نوێ ( سەردەمی ئیمپراتۆریەت ١٥٧٣ - ١٠٨٥ پ.ز):

ئەم سەردەمە هەرسێ بنەماڵەی هەژدەو نۆزدە و بیست ئەگرێتەوە، کە (ئوحموسی یەکەم) بە دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە دائەنرێت، ئەم کەسایەتیە دەستی کردووە بە بەر بەرەکانێکردنی ئەو بارو دۆخە سەختەی، کە هەبووەو گرنگی داوە بەسوپا ئەمەش بۆ ئەوەی هکسۆسەکان بە تەواوەتی لە وڵاتی میسر دەربکات، هەموو ئەو ناوچانەی، کە لەسەردەمی پێشوودا لەژێر دەسەلأتی میسردا بوو، گەڕاندیەوە بۆ ریاری ئەوسای بەمەش کۆتایی بەشەڕ و ئاژاوەی ناوخۆی وڵات هات، دوای ئوحموسی یەکەم زنجیرەیەك لەپادشا هاتنە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی و توانیان، کە بنەماڵەیەکی بەر فراوان لەمیسر دابمەزرێنن، سەرباری میسر ناوچەکانی سوریاو فەڵەستین و سۆدان و لیبیای ئەمڕۆشی گرتەوە....

## ئامونحوتبی سێیەم:

لە پادشا بەناوبانگەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتەکە ئەم کەسایەتییە توانی هێرش بکاتە سەر وڵاتی شام و هەکسۆسەکان بەتەواوەتی لەناوبەرێت و سنووری دەسەڵاتی ناوچەکانی میسر و نوبە تا ڕووباری فورات درێژ بکاتەوە، هەروەها گرنگی داوە بەسوپا و گالیسکەو ئەسپی تیادا بەکارهێناوە، پاشان کەشتی گەلێکی گەورەی دامەزراند و توانی دەسەڵاتی بگەیەنێتە دەریای ناوەڕاست و ناوچەی دورگەکانی دەریای ئیجە.



وێنەی ژمارە (٣١)
ئامونحوتبی سێیەم

## ئامونحوتبی چوارەم:

ئەمیش یەکێکە لەمەلیکەکانی تری ئەم سەردەمەو پاش مردنی باوکی لەساڵی (١٣٧٥ ــ ١٣٥٠پ.ز) فەرمانڕەوایەتی کردووە، ئەم کەسایەتییە بۆ پاراستنی وڵاتی میسر هێرشی کردە سەر وڵاتی نۆبە و نازناوی ئەخناتونی لە خۆی نا کە بە واتای ( خۆشەویستی خواوەند ئاتون) دێت، پاشان شۆڕشێکی ئایینی بەرپاکرد، کە تیایایدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کەتەنیا خواوەند ئاتون (ڕۆژ) بپەرسترێت لەمیسردا.



وێنەی ژمارە (٣٢) ئەخناتوون لەگەڵ نەفرتیتی ژنی

**ئامونحوتبی چوارەم (ئەخناتون) لەگەڵ نێفەرتیتی هاوسەریدا**

لەپاش ئەمانە ئـەخناتوون دەسـتی کـرد بەدرووسـت کردنـی پایتـەختێك بـەناوی ئـەخن ئـاتون، کـە ئێسـتا بـە (تـل العمارنـە) ناسـراوە لەناوەڕاسـتی میسردایە.

## ئەو هۆکارانەی بوونە دروستکردنی ئەم پایتەختە:

١- بـۆ ئـەوەی ببێتـە بنکـەی دەسـەڵاتی سیاسـی و ئـایینی و بـۆ پاراسـتنی دەسەڵاتی خۆی.

٢- شوێنێکی گونجاو لەباری هەبوو ئەمیش بـەهۆی بـوونی ڕووبـاری نیـل لـە ڕۆژهەڵاتیداو هەروەها زنجیرە چیایەکیش لە تەنیشتیەوە، کـەوای ئـەکرد بەئاسانی داگیرنەکرێت.

٣- بۆ ئەوەی شارێکی گونجاو و نوێ بۆ خواوەند ئاتون دابمەزرێنێت، هەروەها لەبەر هەڵستیکردنی پیاوانی ئایینی شاری (طيبة - تیبه) بەدووربێت کەلەبەرامبەر ئایینە نوێیەکەدا ئەیانکرد.

دوای ئەخناتون (توت ئەنخ ئامون) دەسەڵاتی وەرگرت و توانی هێمنی و ئاسایش لەوڵاتدا بەر قەرار بکات، بەڵام کەوتە ژێر گوشاری پیاوە ئایینیەکان و ناچاریان کرد کەواز لەپەرستنی ئاتوون بهێنێت، بگەرێتەوە بۆ پەرستنی خواوەند ئامون و ئەخناتون بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ(تیبه) و لەوێ دەستیکرد بەچاککردنەوەی پەرستگای خواوەند ئامون و گرنگی بەپێشکەوتنی شارستانیەت داوە....

لە دوای توت ئەنخ ئامون چەند فەرمانڕەوایەکی دیکە دەسەڵاتیان وەرگرتووە و تا ماوەیەك بەردەوام بوون، بەڵام سەرەنجام کۆتایی بە دەسەڵاتی ئیمراتۆریەت هات ئەمەش بەهۆی بەکرێگیرانی لیبیەکان و نۆبیەکان کە بوونە هۆی لاوازی سوپای میسرو دەرکەوتنی حیسیەکان، کە بەردەوام مەترسی بوون بۆ سەر میسر هەروەها دەرکەوتن و پەرەسەندنی دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی وەك چینێك، کە زیاتر دەسەڵاتی ئیمراتۆریەتیان لاواز کردووە، تەنانەت هەندێك جار دەسەڵاتیان هێندە زیادی کردووە بوونەتە هۆی کوشتنی پادشا وەك کوشتنی ڕمسیسی سێیەم.

## سەردەمی کۆتایی:

ئەم سەردەمە لە بنەماڵەی بیست و یەکەمەوە تا کۆتایی سیستەمی بنەماڵەکان و هاتنی سوپای موسڵمانەکان بۆ میسر دەگرێتەوە.

**چالاکی:**

گروپێك لە قوتابیان پەخشێکی سەردیوار لە مەڕ ئەهرامەکان دروست دەکەن.

## پرسیارەکانی بەندی پێنجەم

پ١/ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەرەوە:

١- میسر بۆتە خاڵی بەیەکگەیاندنی هەرسێ کیشوەری جیهانی کۆن ................ , ................ , ................ .

٢- میسر بەدەرکەوتنی ................... پێی نایە چاخەنوێیەکانەوە.

٣- گرنگترین هەرەمەکانی میسر بریتین لە ...................... ، ...................... ، ...................... .

٤- گرنگترین شوێنەوارەکانی شانشینی دووەم بریتی بوون لەدوو پەرستگا یەکەمیان بۆ خواوەند ڕەع لە شاری ......................
دووەمیان بۆ خواوەند ئامون لە شاری ...................... .

پ٢ / ئەمانە بناسێنە:

١- مینا ٢- زۆسەر ٣- توت ئەنخ ئامون

پ٣/ گرنگترین هۆکارەکانی دروستکردنی هەرەمەکانی میسر چین؟ بیانژمێرە.

پ٤/ هەکسۆسەکان کێن؟ باس لە فەرمانڕەوایەتیان لە وڵاتی میسردا بکە.

پ٥/ لەسەر شۆرشە ئایینیەکەی ئەخناتون بدوێ.

# بەشی یەکەم

# خێزان و ئەرکەکانی

**خێزان:** بە کۆمەڵە ئادەمیزادێك دەوترێت کە لە ماڵێکدا بەیەکەوە دەژین و چەند پەیوەندییەکی بەهێز بەیەکیانەوە دەبەستێت.

**دوو جۆر خێزان هەیە:**

**خێزانی بچووك:** لە ژن و مێردو کوڕو کچەکانیان پێکهاتووە.

**خێزانی گەورە:** جگە لە دایك و باوك و منداڵەکانیان کەس و کاریشیان لە گەڵیاندا دەژین وەك باپیرەو نەنك و مام و خاڵ و پوری منداڵەکان.

**چالاکی:**

١- قوتابی ئازیز تۆیش وێنەی خێزانێکی بچووك بە دەفتەری چالاکییەکانتەوە بلکێنە.

٢- وێنەی خێزانێکی گەورە بگرەو بیلکێنە بە دەفتەری چالاکییەکانتەوە.

لە خێزاندا گەورە چاودێری بچووك دەکات و بچووك ڕێز لە گەورە دەگرێت و گیانی خۆش ویستن و یارمەتدان و دڵسۆزی و هۆگرییان لەناودا دەچەسپێت و لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشدارن.

بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی خێزان نەخۆش بکەوێت ئەوا کار دەکاتە سەر هەموو خێزانەکەو دڵتەنگیان دەکات و چەند کەسێکیش دەبێ کاروباری خۆیان بەجێ بهێڵن و بەدیارییەوە دابنیشن و خزمەتی بکەن.

خێزان هەرچەندە بچووکیش بێت ئەندامێکە لە خێزانێکی گەورە کە ئەویش کۆمەڵگەی کوردستانە، کە لەسەر خاکی کوردستان دەژین و موڵکی هەمووانە.

ئەنداماني ئەو خێزانە گەورەیە واتا ( کۆمەڵگەی کوردستان ) کۆمەڵێك پەیوەندی بەهێز بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە.

| ئەو پەیوەندییانەی کە تاکەکانی گەلی کوردستان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. | | | |
|---|---|---|---|
| هاوسێیەتی | هاونیشتمانێتی | نەتەوایەتی | مرۆڤایەتی |

**قوتابی ئازیز جگە لە نەتەوەی کورد ناوی چەند نەتەوەیەکی دیکە بنووسە:**

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
|---|---|---|---|
| عەرەب | | | |

## ئەرکەکانی خێزان بەرامبەر بە منداڵ:

خێزان ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگ دەبینێت لە پەروەردەکردن و بەخێوکردن و ئاراستەکردنی منداڵاندا، دەتوانین ئەو ڕۆڵە کاریگەرەی خێزان لەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕوون بکەینەوە:

١- منداڵ لە خێزانەوە فێری خوو ڕەوشتی جوان و خوا پەرستی و ڕێنماییە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت و لەناو خێزاندا زمانی بۆ قسەکردن دەپشکوێت.

٢- خێزان هەڵدەستێت بە گۆشکردن و پەروەردەکردنی منداڵ بە تایبەتی لە ساڵەکانی سەرەتای ژیانیدا تا ئەو کاتەی دەتوانێت خۆی بژێنێت، منداڵ چەندەها ساڵ لەژێر سایەی سەرپەرشتی و پاراستنی خێزاندا دەژی، خێزان جل و بەرگ و پێداویستییەکانی خۆراك و تەندروستی پێشکەش دەکات.

٣- منداڵ گەلێك کاری جوان لە خێزانەوە فێر دەبێت وەك پاکوخاوێنی لەش و جلو بەرگ و ڕێزگرتنی خەڵك و چۆنیەتی ئاخافتن لەگەڵیاندا و چاندنی تۆوی خۆشەویستی و یارمەتدانی خەڵك و دەستدرێژی نەکردنە

سەر سەرو سامانیان و ڕاستگۆیی و لێبوردن و ڕێزگرتنی بیروباوەڕی کەسانی ترو پاراستنی ژینگەو هەموو ئەو کەلو پەلانەی کە موڵکی گشتین.

٤- خێزان هەڵدەستێ بە دابینکردنی پێداویستی منداڵ لە ژیانییدا، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاسودەیی و دڵنیایی بژی، هەروەها خێزان ڕۆڵی گرنگی هەیە لە بنیاتنانی کەسایەتی منداڵدا.

٥- منداڵ لە خێزانەوە فێری بنەما ڕێکخراوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەبێت.

## چالاکی:

١- قوتابی ئازیز هەندێ خوو ڕەوشتی جوان کە لە کتێبەکەتدا نەنووسرابێ بنووسە کە منداڵ لە خێزانەوە فێری دەبێت.




٢- هەندێك پێداویستی ژیانی منداڵ بنووسە کە خێزانەکەی بۆی دابین دەکات بە مەرجێك ئەو پێداویستییانە لە کتێبەکەتدا نەنووسرابێت.



٣- لـه‌م پیتانـه‌ی خـواره‌وه‌دا (دوو) وشـه‌ دروسـت بكـه‌ كـه‌ (دوو) دیـارده‌ی ناپه‌سه‌ندن پێویسته‌ له‌سه‌ر هه‌موومان لێیان دوور بكه‌وینه‌وه‌:

| ی | د | د |
| --- | --- | --- |
| ز | ۆ | ر |

٤-

ماموستای به‌ڕێز داوا له‌ قوتابیه‌كانت بكه‌ چه‌ند دێڕێك ده‌رباره‌ی ڕێزگرتنی گه‌وره‌ له‌لایه‌ن بچووكه‌وه‌ بنووسن

٥-

قوتابی ئـازیز وێنـه‌ی منـداڵێك كـه‌ ده‌سـتی بـاپیری گرتـووه‌و لـه‌ شـه‌قام ده‌یپه‌ڕێنێته‌وه‌ بخه‌ره‌ ناو ده‌فته‌ری چالاكییه‌كانته‌وه‌

## پرسیار

١- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەوەی بۆی دەگونجێت پڕ بکەرەوە:

أ- هەنــدێ خێــزان بــچووکەو پێکهــاتووە لــە .......... ، .......... ، .......... ، .......... .

ب- گـەورە .......... بـچووك دەکـات و بـچووکیش .......... لـە گـەورە دەگرێت.

جـ- منداڵ لەناو خێزاندا زمانی بۆ .......... دەپشکوێت.

د- منداڵ خوو ڕەوشتی جـوان لـە خێزانـەوە وەردەگرێـت وەك .......... ، .......... ، .......... .

٢- ڕاست و هەڵەی ئەمانەی خوارەوە دیاری بکە:

أ- منداڵ لە سەرەتای ژیانیدا دەتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت.

ب- خێزان هەرچەندە بچووکیش بێت ئەندامێکە لە خێزانێکی گەورە.

جـ- خێزان دڵنیایی و ژیانی ئاسوودە بۆ منداڵ دابین دەکات.

٣- بە کورتی و بە بۆچوونی خۆت پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

(خێزان - ڕاستگۆیی - کوردستان - کورد).

| | |
|---|---|
| ---------<br>---<br>-- | فێرخواز |

## قوتابی کێیە؟

خوێندکار ئەو مرۆڤەیە خوێندن دەکات بە پیشە بۆ ئەوەی فێری زانست ببێت و لە داهاتوودا کەسێکی سوودبەخش بێت بۆ خێزان و کۆمەڵگاکەی.

## ئەرکەکانی قوتابی بەرامبەر بە قوتابخانەکەی

لەبەر ئەوەی قوتابی ئەندامێکە لەناو خێزانی خوێندنگادا و خوێندکارانی خوێندنگایەك لەناو خێزاندا دەبن بە دۆست، پێویستە نێوانیان خۆش بێت و لەگەڵ یەکتردا تەبابن و بەرژەوەندی یەکتریان بوێت و یارمەتی یەکتر بدەن و هاوبەشی لەکاروباردا بکەن و ڕێزی یەکتریان لابێت و ڕێز لە بەڕێوەبەرو مامۆستاو کارمەندانی خوێندنگاکەش بگرن و پارێزگاری لە کەلو پەلی خوێندنگاکەشیان بکەن.

خوێندکار لە خوێندنگادا چەند ئەرکێکی دەکەوێتە سەرشان پێویستە لەسەری جێبەجێیان بکات، ئەو ئەرکانەش بریتین لە:

١- پەیڕەوکردنی یاساو ڕێساکانی، ئەو یاسایانەی خوێندنگا، کە وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان دایناوە بۆ هەموو خوێندنگاکان تا پشێوی و ئاژاوە ڕوو نەدات و هەرکەس بە ئارەزووی خۆی لەناو خوێندنگادا هەڵسو کەوت نەکات، دەبێت خوێندکاران پابەندی یاسای خوێندنگا بن و لە چوار چێوەی یاساکە دەرنەچن، چونکە ئەو یاساو ڕێسایانە لە بەرژەوەندی ئەوان و پاراستنی مافەکانیان و ڕێکخستنی کاروبارەکانیان دانراوە.

٢- گوێڕایەڵی بوون بۆ ئامۆژگارییەکانی بەڕێوەبەر و یاریدەدەر و مامۆستا و فەرمانبەرەکانی خوێندنگاکە و دەبێت خوێندکار چی بەباش دەزانێت بۆ

بەرژەوەنـدی و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندنگاکەی جێبەجێی بکات و رێز لە کارمەندان بگرێ و هاوکارییان بکات.

٣- جێبەجێکردنی ئەرکەکانی خوێندنگا بۆ نموونە:

أ ئامادەکردنی وانەکانی

ب جێبەجێکردنی ئەرکی ماڵەوە

جـ ئامادەبوون لەکاتی دەوامدا

د دانەبڕان لە خوێندنگا بەبێ هۆ

ئەگەر قوتابی ئەو کارانەی سـەرەوە جێبەجێ نـەکات ئـەوا مایـە پووچ دەبێت و ئەو ماندوو بوون و هیلاکـییـەی کـە لـە پێناویـدا کێـشراوە لەلایـەن خێزان و دەوڵەت و خوێندنگاوە بەفیڕۆ دەچێت.

٤- پێویستە خوێندکار خوێندنگاکەی بە ماڵی دووەمی خـۆی بزانێت و پارێزگـاری بکات و پاك ڕایبگرێت و هەمیشە بەشدار بێت لەهەر چالاکـییـەکدا کە ئـەنجام دەدرێـت بـۆ چـاککردنەوەو تـەواوکردنی کـەمو کورپییـەکانی خوێندنگاکـەی، چونکە خوێندنگا موڵکی هەمووانە.

ئەگەر خوێندکار لەهەر ژوورێك لەم ژوورانەی خوارەوەی خوێندنگاکەی بوو:

| پۆل | تاقیگە | کتێبخانە | ژووری هونەری | ژووری وەرزش | ژووری کۆمپیوتەر |
|---|---|---|---|---|---|

دەبێت ئاگاداری کەلـوپەل و کەرەسەکان بێت و واهەست بکات هەرچـی لە خوێندنگادایە موڵکی هەمووانەو بۆ ئەوانەشە کە لە دوای ئـەمان دەبـن بـە خوێندکاری خوێندگاکە، بۆیە نابێت دەستکاری ئـەو کـەلو پەلانـە بکـات و تێکیان بدات و بیان شکێنێت.

٥- پاراستنی ئەو پەیوەندییانەی کـە خوێندکارانی خوێندنگایـەك بـە یەکـەوە دەبەستێتەوە لە گیانی تەبایی و خۆشەویستی و برایەتی و متمانە بەیەک کردن و هاوڕێیەتی.

## چالاکی:

١- مامۆسـتای بـەڕێز یارمـەتی قوتابیانـت بـدە تـا چـەند ئـەرکێکی دیکـەی خوێندکار بەرامبەر خوێندنگاکەیان بژمێرن.

٢- خوێندکاری ئازیز هەوڵ بدە چەند سوودێکی پەیڕەوکردنی یاسـاو ڕژێمـی خوێندنگاکەت بژمێریت.

٣- قوتـابی خۆشەویـست بەڕێوەبـەرو یاریـدەدەرو مامۆسـتاکانت هەمیـشە ئامۆژکاریتان دەکەن بۆ کاری جوان و سوودبەخش لەو ئامۆژگاریانە وەك:

أ

ب

جـ

٤- خوێندكار دەتوانێت بەشداری بكات لە چاككردنەوەو تەواوكردنی كەموو كوڕییەكانی خوێندنگادا وەك:




## پرسیار:

١- ڕاست و هەڵەی ئەمانەی خوارەوە دیاری بكە:

أ- ئەگەر خوێندكارێك پلەی یەكەمی بەدەست هێنا لەهەر پێشبڕكێیەكی نێوان خوێندنگاكاندا ئەوا سەربەرزی تەنها بۆ خۆیەتی.

ب- وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی كوردستان سەرپەرشتی كاروباری پەروەردەو فێركردنی قوتابیانی كوردستان دەكات.

جـ- ئەگەر خوێندنگایەك دوو بەڕێوەبەری هەبێت ئەوا كارەكان بەرێك پێكی بەڕێوە دەچێت.

د- نابێت قوتابی ئەركی ئەمڕۆ دوابخات بۆ سبەینێ.

٢- بە كورتی سوودی ئەمانەی خوارەوە بنووسە:

أ- تاقیگە.

ب- كتێبخانە.

جـ- بابەتی هونەر.

٣- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەوەی بۆی دەگونجێت پڕ بکەرەوە:

أ- خوێندکار ئەو مرۆڤەیە کە ............... دەکات بە پیشە.

ب- خوێندکارانی خوێندنگایەك لەناو خۆیاندا دەبن بە دۆست پێویستە نێوانیان خۆش بێت و ............... ، ............... .

جـ- ئەگەر قوتابی ئەرکەکانی ناو خوێندنگا جێبەجێ نەکات ئەوا ئەو ماندووبوونەی لە پێناویدا کێشراوە لەلایەن ............... و ............... ، ............... بە فیڕۆ دەچێت.

٤- بە کورتی و بە بۆچوونی خۆت ئەمانەی خوارەوە بناسێنە:

(یاریدەدەر - ئەرکی ماڵەوە - کۆمپیوتەر).

# قوتابی لە خێزاندا

خێـــزان بەیەکـــەم ژینگـــەی کۆمەڵایـــەتی دادەنرێــت و خوێنـــدکاریش ئەنـدامێکی ئـەو خێزانەیـە، ئـەرکی هـەرە گرنگـی خێزان لـە ژیـان ئەوەیـە منداڵیان ببێت و بە پەروەردەیەکی باش پەروەردەی بکەن.

یەکەم قۆناغی فێربوونی منداڵ لەناو خێزاندایە هەر خێزانیشە جلـوبـەرگ و خواردن و یاری و پێداویستییە سەرەکییەکانی دیکەی ژیانی بۆ دابین بکات.

**چالاکی:**

| خوێندکاری ئازیز تۆش (٥) لەو پێویستییانەی کە خێزان بۆ خوێندکاری دابین دەکات لە دەفتەری چالاکییەکانتدا بنووسە |
|---|

منداڵ لەناو خێزانەکەیدا فێری زۆر شت دەبێت و لاسایییان دەکاتەوە، هەر لـە ئەنـدامانی دیکـەی لـەخۆی گـەورەتری خێزانەکەیـەوە فێـری ڕەوشـتـی جوانی وەکو هاوکاری و ڕێزگرتن و خۆشەویستی دەبێت.

منداڵ بەرهەمی خێزانەو ماڵ بەوانەوە جوان و ئاوەدانە و مایەی دڵخۆشی دایك و باوکن، دەبێ زۆر ئاگاداریان بن و ڕێنمایی باشیان بکەن.

پێویـسـتە لەسـەر دایـك و بـاوك منـداڵ بخەنـە بـەر خوێنـدن و هـەموو پێداویـستییەکانی بـەردەوام بـوون لـە خوێنـدنی بـۆ ئامـادە بکـەن ، بـۆ دڵـنیـابوون لە ئـاستی خـوێندنی ڕۆڵـەکانیان نـاو بەناو سەردانی خوێندنـگا بکەن، لـە کـۆبوونەوەکانی ئـەنجوومەنی دایکان و بـاوکان و مـامـۆستـایاندا ئامادەبن، منداڵەکانیان بپارێزن لە کاری خراپ و تا ئەو کاتەی بە تەواوەتی

گەورە دەبن و لەخەم دەرەخسێن چاودێرییان بکەن.

<table>
<tr><td colspan="2">وەك وەفادارییەك بۆ ئـەرك و مانـدووبوونی دایـك و بـاوك دەبێـت خوێنـدکار چاکەیان بداتەوە ئەویش لە ڕێگەی بە ئەنجام گەیاندنی کۆمەڵێك کاری چاك وەك ئەمانـەی خوارەوە : -</td></tr>
<tr><td>هەوڵدان بۆ بەختەوەری خێزانەکەی</td><td>پاراستنی سیستەمی خێزانەکەی</td></tr>
<tr><td>دەرچوون بە پلەی بەرز لە خوێندنگا</td><td>پابەندبوون بە ڕەوشتی جوان</td></tr>
<tr><td>دوورکەوتنەوە لە منالّی چەتون</td><td>ڕێزگرتنی دایك و باوك</td></tr>
<tr><td>گوێڕایەڵی ئامۆژگاری دایك و باوك</td><td>یارمەتیدانی دایك و باوك</td></tr>
</table>

**چالاکی:**

١- قوتابی ئازیز ئەگەر کچیت یان کوڕیت لـە دەفتـەری چـالاکـییەکانتدا (٥) لـەو کـارە جوانانـە بنووسـە کـە لـە دایـك و باوکتـەوە فێربوویـت و لاسـاییت کردوونەتەوە.

٢- مامۆسـتای بـەڕێز هەنـدێك ڕوون کردنـەوە بـۆ خوێنـدکارەکانت بکـە ، دەربارەی چۆنیەتی سەرەتاکانی دامەزراندنی خێزان.

## پرسیار:

١- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەوەی بۆی دەگونجێت پڕ بکەرەوە:

أ- لەو پێویستییانەی خوێندن کە خێزان بۆ قوتابی دابین دەکات وەك .......... و .......... .

ب- خێزان بەیەکەم ژینگەی .......... دادەنرێت و .......... یش ئەندامێکی ئەو خێزانەیە.

جـ- لە نموونەی کاری چەوت و خراپ کە پێویستە خوێندکار لێی دوورکەوێتەوە وەك .......... و .......... .

د- دایك و باوکی خوێندکار گەلێك ئامۆژگاری ڕۆڵەکەیان دەکەن لەو ئامۆژگارییە چاکانە وەك .......... و .......... .

# بەشی دووەم

# قوتابی لە قوتابخانەدا

## قوتابخانە :

دەزگایەکی زانستی و کۆمەڵایەتی گشتییە خوێندکار تیایدا فێری پەروەردەو زانستە جۆراو جۆرەکان دەبێت.

لە پێشدا خوێندنگا ئەم شێوازە پێشکەوتووەی ئێستای نەبوو، لە سەرەتاوە مرۆڤەکان ژیانێکی زۆر سادەو ساکارییان بووە، بەڵام وردە وردە گەڕان بەدوای پێداویستییەکانی ژیاندا ئیتر پێویستی خوێندن و فێربوون هاتەکایەوە تا وای لێهات کۆمەڵگە بیر لە هێنانەکایەی دامەزراوەیەك بکاتەوە بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیان تا بتوانن سەرکەوتووبن بەسەر کۆسپەکانی ژیاندا، ئیتر خوێندنگا بووە پێویستییەکی ژیان و لە سەرەتادا سادەبوو، بریتی بوو لە خانووێک بۆ خوێندنی منداڵی پاشاکان و چینە دەسەڵاتدارەکان و پاشان بۆ ڕۆڵەی چینەکانی تری کۆمەڵگا .

لەو کەسایەتییە کوردە ناودارانەی کە ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لە کردنەوەی خوێندنگاو هاندانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بۆ فێربوون و خوێندن وەك:

میری سۆران

ئیبراهیم پاشای بابان

بەدرخان پاشا

حەپسە خانی نەقیب

ئەمین زەکی بەگ

خانزادی سۆران

مەلا گەورەی کۆیە

قەدەم خێر

نەجمەدین مەلا

## چالاکی:

١- قوتابی ئازیز وێنەی خوێندنگایەك بلكێنە بە دەفتەری چالاكییەكانتەوە.

٢- ئەگەر وێنەی هەندێك لەو كەسایەتییانەی سەرەوەت دەست كەوت بیخەرە ناو دەفتەری چالاكییەكانتەوە.

ئێستا لە هەرێمی كوردستاندا لە هەموو گوندو شارو شارۆچكەكاندا ژمارەیەكی زۆر خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی كراوەتەوە، رۆڵەی هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵگای كوردەوای تیایدا دەخوێنن و مامۆستای لێهاتوو وكارامەیان بۆ دابین كراوەو پێداویستییە سەرەكییەكانی خوێندنیش بۆ ئەو خوێندنگایانە ئامادە كراوە، وەك:

| پۆلی خوێندن | تەختەی | تاقیگە | كتێب |
|---|---|---|---|

## چالاكی:

قوتابی خۆشەویست دەتۆش ناوی هەندێكی تر لە پێداویستییەكانی خوێندن لە دەفتەری چالاكییەكانتدا بنووسە.

خوێندكار ئەندامێكی خێزانی خوێندنگایە و پێویستە هەمیشە وابیر بكاتەوە كە خوێندنگا ماڵی دووەمیەتی.

خێزانی قوتابخانە پێك هاتووە لە:




مامۆستاكان لەجێی دایك و باوكن و زۆر دڵسۆزی خوێندكارن، وەك ڕۆڵەی خۆیان سەیری دەكەن و مامەڵە و ڕەفتاری سوود بەخشییان لەگەڵدا دەكەن، هەموو توانایەكیان دەخەنە گەڕ تا بە جوانترین شێوە پەروەردەیان بكەن و بە تازەترین ڕێگا فێری زانستیان بكەن، هەر كاتێك مامۆستا ببینێت خوێندكارەكانی لە وانەكانیاندا سەركەوتوون ئەوا زۆر دڵخۆش دەبن و هەموو ئەرك و ماندووبونێكی خۆیان لەبیر دەچێتەوە.

## ئەو قوتابیانە کە مامۆستاکان زۆریان خۆش دەوێن

| | |
|---|---|
| خوێندکاری سەرکەوتوو لە وانەکان و هەموو چالاکی و بۆنەکانی خوێندنگادا کە سەری خوێندنگا و خێزان و هاوڕێکانی بەرزبکاتەوە. | ١. |
| ئەو قوتابیەی کە هەموو ئەرکەکانی سەرشانی بەبێ کەم و کوڕی جێبەجێ دەکات و ئەرکی ئەمڕۆ ناخاتە سبەینێ. | ٢. |
| ئەو خوێندکارەی پابەندی ڕێنمایی و یاساکانی خوێندنگایەو هیچ سەرپێچییەک ناکات. | ٣. |
| ئەو خوێندکارەی کەل وپەلی خوێندنگا دەپارێزێت و بە ئاگادارییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. | ٤. |
| ئەوانەی پاك و خاوێننی و پاك و خاوێنی پۆل و گۆڕەپان و هەموو شوێنەکانی خوێندنگا دەپارێزن. | ٥. |
| ئەوانەی کە بەڕێزن و ڕێز لە هەموو ئەندامانی خێزانی خوێندنگا دەگرن. | ٦. |
| قوتابی ڕاستگۆ، دەستپاک ، دڵسۆزو خاوەن ڕەوشتی جوان . | ٧. |
| ئەو خوێندکارانەی کە هەرگیز بەبێ هۆ لە خوێندنگا دوا ناکەون، خۆیان نادزنەوەو لاسار نین و شەڕ بە هاوڕێکانیان نافرۆشن و دەستکاری کەلوپەلی هاوڕێکانیان ناکەن. | ٨. |

**چالاکی:**

١- مامۆستای بەڕێز تکایە هەندێك لە زیانەکانی دواکەوتن و خۆدزینەوەی خوێندکار لە خوێندنگا بۆ خوێندکارەکانت باس بکە.

٢- قوتابی ئازیز ڕاپۆرتێك بنووسە بۆ مامۆستاکەت دەربارەی گرنگی ڕاگرتنی پاك و خاوێنی خوێندنگا.

٣- قوتابی خۆشەویست تۆش هەندێك سیفەتی باشی ئەو خوێندکارانەی کە مامۆستاکان خۆشیان دەوێن لە دەفتەری چالاکییەکانتدا بنووسە.

## پەیوەندی نێوان قوتابیان

قوتابخانە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی بچووکەو خوێندکاران بەشی زۆری کاتی خۆیان لەوێ بەسەردەبەن، جا بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵگە بچووکە ئاوات و ئامانجەکانی بهێنێتە دی دەبێت گیانی تەبایی و هاوکاری و خۆشەویستی و گوفتاری جوان و متمانە بەیەک کردن لە نێوانیاندا جێگیر بێت.

| گرنگترین پەیوەندییەکانی نێوان خوێندکارانی خوێندنگایەك |
|---|

پەیوەندی ڕۆشنبیری

پەیوەندی هاوڕێیەتی

پەیوەندی هاونیشتمانێتی

وا لە خوارەوە باس لە هەریەکە لەو پەیوەندیانە دەکەین:

## ١- پەیوەندی ڕۆشنبیری:

قوتابیانی قوتابخانە بە تایبەتی خوێندکارانی پۆلێك ئاستی ڕۆشنبیرییان لە یەکەوە نزیکە.

**هۆ:** بۆچی خوێندکارانی پۆلێك ئاستی ڕۆشنبیرییان لەیەکەوە نزیکە؟

**وەڵام:** چونکە.

| | |
|---|---|
| أ | لەیەك سەرچاوەوە ڕۆشنبیری وەردەگرن |
| ب | یەك جۆر وانە دەخوێنن |
| جـ | یەك ئامانج پاڵیان پێوە دەنێ ئەویش فێربوون و زانینە |

گفتوگۆی نێوان خوێندکارانی یەك پۆل لە بارەی زانین و فێربوونەوە بەرەو پێشکەوتن و گەشەکردن و سەرکەوتنیان دەبات و ئەو گفتوگۆو وەڵام دانەوەی پرسیارانە تەبایی و خۆشەویستی و ڕێزگرتن لە نێوان خوێندکارەکاندا زیاد دەکات، هەر خوێندکارێك توانای بەهرەو ڕادەی لێهاتوویی و ئارەزووەکانی ئەوانی دیکەی بۆ دەردەکەوێت.

بەم جۆرە پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان خوێندکارەکاندا دروست دەبێت و لەوانەیە ئەم پەیوەندییە دوای دەرچوونی خوێندکارەکان لە خوێندنگاش هەر بەردەوام بێت و ببێتە جوانترین یادگاری ژیان.

هەندێ جار خوێندنکارێك لەناو هاوڕێکانیدا دەبێت بە نمونەی ڕەوشت و کرداری جوان و گوێڕایەڵی مامۆستاکانی دەبێت و ڕێزیان لێ دەگرێت و لەوانەکانیدا پلەی بەرز بەدەست دەهێنێت، خوێندکارەکانی دیکە چاوی لێ دەکەن، جا هەر خوێندکارێك بیەوێت وەك ئەو هاوڕێیەی بێت هەوڵ دەدات لێی نزیك ببێتەوەو وەك ئەو ڕەفتار بکات.

## ٢- پەیوەندی هاوڕێیەتی:

قوتابیان برای یەکن، هەموویان بە تێکڕایی دژی دوژمنی هەمووان کە نەزانینە تێ دەکۆشن، بە شێوەی گروپی بچووك بچووك بەیەکەوە دەخوێنن و ئەرکەکانی ماڵەوە جێبەجێ دەکەن و لە پێناوی وەدەستهێنانی زانیاری و زانستدا یارمەتی یەك دەدەن و هاوکاری لەگەڵ یەکدا دەکەن، بۆ ئەوەی ئەو هاوکارییە دروست ببێت دەبێت پەیوەندی نێوان خوێندکاران لەسەر بناغەی خۆشەویستی و تەبایی بنیات نرابێت.

پێویستە لەسەر خوێندکار بیروڕاو کردارو ڕەفتارەکانی لەلایەن هاوڕێکانییەوە پەسەند بێت، دڵخۆشی دەکات بەڵام بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ڕەفتاری ناپەسەند بوو نیگەران و دڵتەنگ دەبێت ئەگەر ئاوڕیان لێ نەدایەوەو گاڵتەیان پێ کرد.

| بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی نێوان قوتابیان بەردەوام و بەهێز بێت پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکەن |
|---|
| ١ چاوپۆشیکردن لە هەڵەو چەوتییە سادەکانی یەکتر.<br>٢ ڕێز لە کاری یەکتر بگرن.<br>٣ گیانی لێبوردنیان تیادا بێت.<br>٤ بە خۆشی یەکتر شادمان بن و هاوبەشی ناخۆشی یەکتربن.<br>٥ بڵاونەکردنەوەی هەواڵی درۆو پڕوپاگەندەی دژ بە یەکتر.<br>٦ ناوو ناتۆرەی ناشیرین لە یەکتر نەنان و سووکایەتی نەکردن بەیەکتر.<br>٧ دەبێت جێی متمانەی یەکتر بن و باوەڕیان بەیەك هەبێت و بۆ قازانجی هەمووان ڕەفتار بکەن.<br>٨ دەبێت قوتابی بە یەکسانی و بەیەك پێوەر سەودا لەگەڵ برادەرەکانیدا بکات و ڕاست و لەڕوو بێت و لە پاشەملە باسی هاوڕێکانی نەکات.<br>٩ دوورکەوتنەوە لە شەڕانگێزی و لەیەکتر تووڕە نەبن و بە خراپە باسی یەکتر نەکەن.<br>١٠ ڕەخنەی ڕووخێنەر لەیەك نەگرن، زۆر بە هێمنی خراپەو کەم و کوڕییەکانی یەکتر بخەنە ڕوو و چارەسەری گونجاوی بۆ دابنێن. |

## چالاكی:

١- مامۆستای بەڕێز قوتابیانی پۆلەكە دابەش بكە بۆ (٦) گروپ یان كەمتر، پرسیارێكیان ئاڕاستە بكە دەربارەی ئەوەی ئایا تا چ ڕادەیەك ئەوان چاو لە خوێندكاری زیرەك و خاوەن ڕەوشتی جوان دەكەن، دوایی هەوڵ بدە وەڵامەكانی هەر (٦) گروپەكە هەڵبسەنگێنیت.

٢- خوێندكاری خۆشەویست لە دەفتەری چالاكییەكانتدا چەند دێڕێك دەربارەی پەیوەندی بەهێزی نێوان تۆو هاوڕێكانت بنووسە.

٣- قوتابی ئازیز (٣) خاڵ دەربارەی كاركردنی خوێندكاران بۆ قوتابخانە.

أ- ........................................

ب- ........................................

جـ- ........................................

٤- ئەگەر خوێندكارێكی هاوڕێت هەڵەیەكی كرد بە كام شێوە لەم شێوانەی خوارەوە تێی دەگەیەنیت كە هەڵەیە، نیشانەی ( ✓ ) لەناو چوار گۆشە ڕاستەكەدا دابنێ:

أ- لێی توڕە دەبم. ☐

ب- بە توندی ڕەخنەی لێ دەگرم. ☐

جـ- بە هێمنی تێی دەگەیەنم كە هەڵەیە. ☐

## ٣- پەیوەندی هاونیشتمانێتی:

نیشتمان ئەو پارچە زەوییە سنوردارەیە کە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەری دەژین و چەند پەیوەندییەك بە یەکیانەوە دەبەستێت.

ئێمەو هەموو ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەسەر خاکی ئەم وڵاتە خۆشەویستەمان کە کوردستانە دەژین، ئەو وڵاتەی باو و باپیرانمان بە ئارەقی ناوچەوان و خوێنی گەشیان ئاویان داوەو بە گیانی خۆیان بەرگرییان لێ کردووە.

ئەم خاکە هەموو ئەو شتانەی تیایەتی لە:




ماڵی هەموو هاونیشتمانییانەو هەموویان پێکەوە لەشایی و شیوەندا هاوبەشن و شانازی بەو دەستکەوتانەوە دەکەن کە باپیرانمان پێشکەشیان کردووین.

خوێندکارانی کورد بە گشتی ڕۆڵەی نیشتمانێکن و لە پێناوی پاراستن و بەرزکردنەوەی شان و شکۆی نەتەوەکەیاندا کۆشش دەکەن و چالاکی دەنوێنن، کەواتە هەستێك هەیە خوێندکارانی نەتەوەیەك بەیەکەوە دەبەستێت، ئەویش هەستی نەتەوایەتی و هاونیشتمانێتییە.

## پرسیار:

١- به کورتی و به بۆچوونی خۆت پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

(نیشتمان - فێرخواز - حەپسەخانی نەقیب - لێبووردن)

٢- وەڵامی ڕاست لەناو کەوانەکاندا هەڵبژێرە:

قۆناغی خوێندنی ناوەندی (٢، ٣، ٤) ساڵە.

٣- لەم خشتەیەی خوارەوەدا ناوی دوو کەسایەتی کورد بدۆزەرەوە کە ڕۆڵیان هەبووە لە بەرەو پێشبردنی خوێندن لە کوردستاندا:

| ه | م | م | ر | خ | ا |
|---|---|---|---|---|---|
| م | ق | ر | ێ | ع | ه |
| ف | ر | ن | یـ | د | س |
| ن | ی | ۆ | ا | س | ش |

٤- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەدەستەواژەیەکی دەگونجێت پڕ بکەرەوە:

١- لەو کانزایانەی کە لە ژێر خاکی کوردستاندا هەیە ............ و ............ .

٢- لە دەشتە بە پیتەکانی کوردستان ............ .

٣- لە سەرەتادا خوێندنگا بە سادەیی لە ............ دابوو.

٤- ماڵی یەکەمی قوتابی ............ ە بەلام ماڵی دووەمی ............ .

٥- لە ئەندامانی خێزانی خوێندنگا ............ و ............ و............ .

٦ـ خوێندکار دەتوانێت بەشداری لە پاك و خاوێنی خوێندنگادا بکات لەڕێی ............ و ............ .

٧- ئەرکی ئەمڕۆ مەخەرە ............ .

٨- خوێندنگا کۆمەڵگەیەکی بچووکە و قوتابیان لەوێ بەشی زۆر ............ یان بەسەر دەبەن.

# فێرخواز و کۆمەڵگە

**کۆمەڵگە :** بریتییە لە کۆمەڵە مرۆڤێك کە لەسەر پارچە زەوییەکی دیاری کراو نیشتەجێ بوون و چەند پەیوەندییەك بەیەکیانەوە دەبەستێت.

خێزان بەیەکەم ژینگەی کۆمەڵایەتی دەژمێردرێت، هەر کۆمەڵگەیەك لە چەندین هۆزو بەرەپێکهاتووە، ئەوانیش لە چەند خێزانێك پێکهاتوون.

هەر کۆمەڵگەیەك چەند بنەمایەك لە کۆمەڵگەکانی تری جیادەکاتەوەو بەم جۆرە جیهان لە چەند کۆمەڵگەیەک پێکدێت کە لە یەکتری جیاوازن و هەندێك لەیەکچوونیش لە نێوان کۆمەڵگە جیاجیاکاندا هەیە.

ئەم کۆمەڵگایانەی ئێستا لە جیهاندا هەن (بە کۆمەڵگەی کوردەواریشەوە) بە چەند قۆناغێکی یەك لە دوای یەکدا تێپەڕیون تا گەیشتوونەتە ئەم قۆناغەی ئێستایان.

لەبەر ئەوەی قوتابی ئەندامی خێزانێکەو خۆی و خێزانەکەیشی سەر بە کۆمەڵگایەکن کە تیایدا لە دایك بوون و ژیاون و لەخێرو خۆشی و بەروبوومیان خواردووە و لە ناخۆشیشدا هاوبەشی ئەو کۆمەڵگایە بوون، بۆیە لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵگەدا چەند پەیوەندییەك بە یەکیانەوە دەبەستێت.

قوتابی و خوێندکار وەك ئەندامێکی کۆمەڵگە چەند ئەرکێکی لەسەر شانە بەرامبەر کۆمەڵگەکەی پێویستە جێبەجێی بکات، ئەو ئەرکانەش بریتین لە:

١- هەوڵ و كۆشش بۆ بەرزركردنەوەی ئاستی زانیاری و دەرچوون بە پلەی بەرز، چونكە خوێندكار لە داهاتوودا بەشداری دەكات لە بنیاتنانی ژیانی كۆمەلایەتی بە شێوەیەكی بەرفراوان كە ئاستی زانیاری مەرجێكی گرنگە بۆ ئەو بەشداری كردنە.

٢- خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوە، چونكە سەروەری گەل و نیشتمان سەروەری خوێندكاریشە، پێویستە قوتابی بەشداری بكات لە تیمەكانی فریاكەوتن و تیماركردن....هتد لەكاتی پێویستدا.

٣- هاوكاریكردنی دەزگاكانی حكومەتی هەرێمی كوردستان لە قەلاچۆكردنی دیاردە دزێوو ناشارستانییەكان و هەموو جۆرەكانی تری تاوان.

٤- بەشداریكردن لە پاراستنی هێمنی و ئاسایش و جێبەجێكردنی یاساكان و پاراستنی تەندروستی و پاك و خاوێنی بە بەشداریكردن لە هەڵمەتەكانی پاككردنەوەی گەڕەك و شەقام و كۆڵانەكاندا.

٥- هاندانی خەڵك بۆ بەفیڕۆنەدانی سامانی نیشتمانی بە تایبەتی ئاوو كارەبا، چونكە بەدەست هێنانیان كارێكی ئاسان نییە.

٦- ڕێزگرتنی پیر و پەككەوتە و كەم ئەندامەكان، چونكە ئەوانیش برامانن و ڕۆڵەی ئەم گەلەن، ڕێز گرتنیان وەفادارییە بۆ ئەو ڕۆڵەی كە هەیان بووەو دەیان بێت لە بەرەو پێشبردن و گەشەكردنی كۆمەڵگەی كوردەواریدا.

٧- بەشداریكردن لە هەڵمەتەكانی ناشتنی نەمام و نەبڕینی دارو درەخت و پارێزگاری كردنی، چونكە سوودی هەمە جۆری هەیە.

٨- پاراستنی هەموو دەستكەوتەكانی كۆمەڵگە وەك گڵۆپ و وایەری كارەبا و تەلەفون و كەلوپەلی یاریگاو مەلەوانگەو سەیرانگەو شوێنە گشتییەكان و هەموو ئەو شتانەی تریش كە موڵكی هەموانە.

## چالاکی:

١- مامۆسـتای بـەڕێز داوا لـە قوتابیـەکانت بکـە بابـەتێك لـە دەفتـەری چـالاکیـیەکانیاندا بنووسـن دەربـارەی (خوێنـدکار لـە داهـاتوودا بەشـداری دەکات لە بنیاتنانی کۆمەڵگادا).

٢- خوێنـدکاری ئـازیز وێنـەی ئوتـومبێلێکی ئـاگر کوژاندنـەوە پەیـدا بکـەو بیلکێنە بە دەفتەری چالاکییەکانتەوە.

٣- لە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە قەڵاچۆی تـاوان دەکـەن وەك:

أ ب

٤- بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان خوێنـدنگاو دام و دەزگاکـانی دەوڵـەت ، مامۆسـتا دەتوانێـت داوا لـە بەڕێوەبـەر بکـات کـە میوانـداری ئەفـسەرێکی هاتووچـۆ یـان ئەفـسەرێکی بـەرگری مـەدەنی بکـات بـۆ خوێنـدنگا، یـان خوێندکارەکان ببات بۆ سـەردانی دەزگـای ئـاگر کوژاندنـەوە یـان سـەردانی دەزگایەکی شارەوانی.

# پەیوەندی نێوان خوێندنگەو کۆمەڵگە

خوێندنگە ئەو دەمە دەتوانێت پـێش بکـەوێت و ئـەرکی سەرشـانی خـۆی زۆر بـە باشـی جێبەجێی بکـات کـە پەیوەنـدی تونـدو تـۆڵی لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵگەیەدا هەبێت کە خوێندنگەی تێدایە و پێویستە کۆمەڵگەش دەستی یارمەتی و هاوکاری بۆ خوێندنگەکە درێژ بکات و هاوکارییان بکات بۆ باشتر بەڕێوەچوونی پرۆسەی خوێندنی ڕۆڵەکانیان.

زۆر لـە کۆمەڵگـەکان هـەوڵ دەدەن کـە پەیوەنـدی بـەتین لـە نێـوان خوێندنگەو دایکان و باوکاندا هەبێت لە پێناو پەروەردەکردن و پێگەیاندنی خوێندکارەکان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست.

ئایا باشترین هۆکارو شێواز بۆ هێنانـەدی هاوکـاری لـەنێوان کـەس و کـاری خوێندکاران و خوێندنگادا چییە؟

**وەڵام/** بەستنی کۆبوونەوە یان کۆڕی لە نێوان مامۆستایان و بەخێوکەری خوێندکاران.

ئەم کۆبووەنەوەیە بۆ چ مەبەستێك ئەنجام دەدرێ؟

**وەڵام/** ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

| ١ | بۆ زانینی پلەی پێشکەوتنی خوێندکاران. |
|---|---|
| ٢ | زانینی ئارەزووی خوێندکارەکان و سنووری تواناکانیان. |
| ٣ | ئاگاداربوون لـە گیروگرفـت و تـەنگ و چـەڵەمەکانی خوێنـدکاران لـە ماڵەوە و لە خوێندنگادا. |

خوێندنگه و ماڵەوە تەواوکەری یەکترن و خوێندنگا بە ئاسانی دەتوانێت پەیوەندی بە بەخێوکەری قوتابییەوە بکات ، بە پێچەوانەوەشەوە بەخێوکەری خوێندکارەکە دەتوانێت سەردانی خوێندنگا بکات ، هەواڵی ڕۆڵەکەی بپرسێت و چاوی بە بەڕێوەبەرو ڕابەری پۆل و مامۆستاکانی وانەکان بکەوێت.

ئەم کۆڕو کۆبوونەوانە هەموو ساڵێك لەگەڵ دەست پێکردنی خوێندندا دەست پێ دەکات و مانگی جارێك یان بەپێی پێویست کۆبوونەوە ئەنجام دەدرێت، سەرۆکی ئەنجومەنی دایکان و باوکان و مامۆستایان یان لە ناو دەستەی مامۆستایان یان لەناو کەس و کاری خوێندکارەکاندا هەڵدەبژێررێت، لەسەرەتای ساڵدا خەڵکەکە بانگ دەکرێن بۆ خوێندنگا بۆ کۆبوونەوەو باس کردنی ئەو پلانەی کە ئەو ساڵە لەسەری دەڕۆن.

شایانی باسە لە ئەنجامی کۆبوونەوەکانی دایکان و باوکان و مامۆستایاندا گەلێك کاری بەنرخ و پرۆژەی بەکەڵك دێتە بەرهەم.

## ئەو کارانەی ئەنجومەنی دایکان و باوکان و مامۆستایان جێبەجێی دەکات

١ـ لەسەرەتای ساڵی خوێندنی نوێدا دایك و باوکی خوێندکاران لە پرۆگرامی خوێندنگا ئاگادار دەکرێن تاوەکو وێنەیەکی ڕوونی خوێندنگاکەیان لەبەرچاو دابێت.

٢ ـ لە داهێنانی چالاکی نوێ بۆ خوێندنگا سوود لە تواناکانی باوکان و دایکان وەردەگیرێت.

٣ ـ هاوکاری کردن بۆ دەستنیشان کردنی کێشەکانی خوێندکاران و دانانی ڕێگە چارەی گونجاو بۆ کێشەکانیان.

٤ ـ دابینکردنی هەندێ پێویستی خوێندنگا بێ ئەوەی لە بودجەدا پارەی بۆ تەرخان کرابێت وەك چاککردنی کورسی شکاو و بۆیەکردن و تەواوکردنی کەم و کوڕییەکان و پێویستییە جۆراوجۆرەکان.

٥ ـ سوود وەرگرتنی بەخێوکەری خوێندکار بە گوێگرتن لە وتاری بەڕێوەبەری خوێندنگاو مامۆستایان و خوێندکاران و کۆڕەکان ئاگاداری پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیان دەبن.

٦ ـ هاوکاری کردن لە نێوانیان بۆ زاڵبوون بەسەر دیاردەی راکردن لە خوێندنگا و بە ئاگابوون و لە ڕەوشتی خوێندکاران و دڵنیابوون لە خۆیان و لە لەش ساغییان.

## یاساو ڕێساکانی قوتابخانه

بریتییه له کۆمەڵێك یاساو ڕێسا و ڕێنمایی پەروەردەیی بە مەبەستی ڕێکخستنی پرۆسەی پەروەردەیی. ئەو یاساو ڕێسایانە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان خێزانی خوێندنگا دانراون، ئەم یاساو ڕێسایانە لەلایەن کەسانی شارەزای پەروەردەییەوە دەرکراون، پێویستە لەسەر هەموو ئەندامانی خێزانی خوێندنگا کە پەیڕەوی بکەن و زۆر بە وردی جێبەجێی بکەن.

ئەو ڕێنماییانە شیاوی گۆڕانکارییە بەپێی بەرەو پێش چوونی زانست و بەپێی فەلسەفەی پەروەردەی وڵات کە هەڵقوڵاوی بارودۆخی کۆمەڵایەتی خوێندکارانەو بە گشتی لە خزمەتی ئەواندایە تا بە شێوەیەکی مۆدێرن سوودمەند پەروەردە بکرێن.

هەروەها ئەو ڕێنماییانە لە چوار چێوەی چەند یاساو ڕێسایەکی ڕێک و پێکدا داڕێژراوەو پەیوەندیدارە بە بوارەکانی:

| دەوامکردن | تۆمارە جۆراجۆرەکانی خوێندنگا | بڕوانامە |
|---|---|---|

| تاقیکردنەوەکان |
|---|

ئەرك و كارەكان لە خوێندنگادا بە گوێرەی یاساو ڕێساكان دابـەش بـووە بەسەر:

| بەڕێوەبەر | مامۆستاكان | كارگوزارەكان | خوێندكارەكان |
|---|---|---|---|

بۆ ئەوەی هەریەكێ لەو ئەندامانە ئەرك و مافەكانی خۆی بزانێت ئەوا دەبێ پابەندی ئەو ڕێساو یاساو ڕێنماییانە بێت، بەڵام ئەگەر پشتگوێیان بخات تووشی لێپێچینەوەو بەرپرسیارێتی دەبێت.

بۆ ئـەوەی ئـەو ڕێساو یاسایانە لە ونبوون و لەناوچوون بپارێزین ئەوا دەزگا پەروەردەییە بەرپرسەكان هاتوون هەموویان كۆكردۆتەوە لە دوو تۆیی چەند كتێب و نامیلكەیەكدا چاپكراوەو دابەشیان كردووە بەسەر خوێندنگاكاندا.